# جەلال تاڵەبانی

# زنجیرە وتارێکی سیاسییە
# دەربارەی
# فیدراڵی یەکگرتن
# یەکێتیی نیشتمانیی عیراقی

وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە: جەوهەر کرمانج

# زنجیره وتارێکی سیاسییه
## دەربارەی
# فیدراڵی یەکگرتن و
# یەکێتیی نیشتمانیی عیراقی

٢٠٠٤


## جەلال تاڵەبانی

لەعەرەبییەوە: جەوهەر کرمانج

ناوی کتێب: زنجیرە وتارێکی سیاسی دەربارەی فیدراڵی یەکگرتن‌و یەکێتیی نیشتمانیی عیراقی
نوسینی: جەلال تاڵەبانی
لەعەرەبییەوە: جەوهەر کرمانج
بابەت : زنجیرە وتار
چاپ : ئۆفسێتی (ژین)
نەخشەسازی بەرگ : مەحمود خۆشناو
چاپی یەکەم – سلێمانی ٢٠٠٤
تیراژ : (٣٠٠٠)
ژمارەی سپاردن : ( ٢٦١ )ی وەزارەتی رۆشنبیری ساڵی ٢٠٠٤ ی پێدراوە.

سەرپەرشتی پرۆژەی چاپکردنی زنجیرە کتێبی شارەوانیی سلێمانی:
پێشرەو ئەحمەد

## پێرستی بابەتەکان

*پاکتــاوکردنی نــەژادیی و مەترســییەکانی لەســەر یــەکێتیی نیشتمانیی عیراقیدا

بەشی یەکەم

بەشی دووەم

*لــەناوبردنی پاکتــاوکردنی نــەژادی نــەك پــەیڕەوکردنی پاکتاوکردنی نەژادی لەکەرکوك

*ئاســاییکردنەوەی بارودۆخــەکانی کــەرکوك پێداویســتیەکی نیشتمانییە

*بەرژەوەندییە راستەقینەکانی نەتەوەی تورکمان لەکوێدایە..؟

بەشەکانی ١و٢و٣و٤

خوێنەری ئازیز:

ئـەو نامیلکەیـەی بەردەسـتتان زنجـیرە وتارێکـە لەڕۆژنامـە جیاجیاکـاندا بڵاوکراونەتـەوەو پـەیوەندییان بەمەسەلە هەنووکەییەکانی عیراق و کوردستانەوە هەیـە کـەدوای رووخـانی رژێمـی بـەعس رووبـەڕووی سـەرکردایەتی سیاسیی گـەلی کوردسـتان و لایەنـەکانی ئۆپۆزسیۆنی عـیراقی و ئـەندامانی ئەنجومـەنی حوکـم و سـەرجەم خـەڵکی عـیراق بووەتـەوە. تیشـك خستنەسـەر ئەو مەسەلانەو روونکردنەوەیان کارێکی پێویست بوو، بەتایبـەتیش بـۆ گـەلی عـەرەب، هـەر بۆیـەش وتارەکـان بەزمانیعـەرەبی بڵاوکرانـەوە، بـەڵام لەهـەمان کاتیشـدا دەبـوو خـەڵکی کوردسـتانیش لێـی ئاگـاداربن چونکـە نـەوەی ئێسـتای کـورد زۆر بەدەگمـەن شـارەزاییان لەزمانی عەرەبیدا هەیە.

فیدرالیـەت، چییـەو چۆنمـان دەوێ و بەرامبـەرەکانمان چۆنی لێدەڕوانن یەکێکە لـەو بابەتانـەی لـەم نامیلکەیـەدا

بەچەند وتارێ قسەی لەسەر کراوەو ئەو گرێو گۆڵانەی لەملاو لەولادا قسەو باسیان لەسەر دەکرێ روونکراونەتەوە، هەروەها مەسەلەی پاکتاوکردنی نەژادی کەرژێمی لەگۆڕنراو هەر لەسەرەتای هاتنەسەر کاریەوە بەشێوەیەکی نامرۆڤانەو پێچەوانەی هەموو داب و نەریت و ئایین و یاسا نێودەوڵەتییەکان دژی کورد پەیرەوی کردبوو، بەتایبەتیش لەسنووری نێوان کوردستان و عیراقی عەرەبیدا، ئەویش بەمەبەستی گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی و نیشتمانیی ئەو ناوچانە کە بەدەرکردنی کوردو تورکمان و کلدۆئاشووری دەستییپێکردو لەشوێنی ئەواندا عەرەبی شیعە نیشتەجێ کران.

بۆ ئەوەی بەبەردێك دوو چۆلەکە بپێکن، یەکەمیان بەعەرەبکردنی ناوچەکان و دووەمیشیان گۆڕینی سیمای مەزهەبی ناوچەکان لەسوننەوە بۆ شیعە، بۆ ئەوەی لەئایندەدا فیتنەو ئاژاوە لەنێوان گەلی کوردو تورکمان و کلدۆئاشووری لەگەڵ عەرەب بەرپا بکەن لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە ئاگری شەڕێکی مەزهەبی بخەنە نێوان سوننەو شیعە کە بەدرێژایی بوونی دەوڵەتی عیراقی بەبرایەتی و تەبایی پێکەوە ژیاون و رۆژێ لەرۆژان جیاوازیی نەتەوەو ئایین و مەزهەب نەبووەتە کێشە لەنێوانیاندا.

مەسەلەیەکی دیکەش کە لەم وتارانەدا باسی لێوەکراوە مەسەلەی ئاساییکردنەوەی باروودۆخی

کـەرکوك‌و ئـەو ناوچانەیـە کـە بـەر سیاسـەتی بەعـەرەبکردن‌و راگوێـزان کـەوتبوون، کەئـەویش بەگەڕانـەوەی دەرکـراوو راگوێزراوەکـانی کـوردو تورکمـان‌و کلدۆئاشـووری دەبـێ بـۆ زێـدی بـاب‌و باپیرانیـان‌و قەرەبووکردنـەوەی ئـەو زیانانـەی لێیـان کەوتووەو گێڕانەوەی عەرەبە هاوردەکانیش بۆ شوێنی پێشوویان.

لـەکۆتاییدا دەمێنێتـەوە ئـەوە بڵێـین: ئـەم وتارانـە هێندێکیـان ڕاستەوخۆ بە نـاوی جـەنابی مـام جـەلال نووسـراون‌و ئەوانـەی دیکەشـیان سـەروتاری ڕۆژنامـەی (الاتحـاد)ن کـەزمانحاڵی یـەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتانەو هێندێکیشـیان لـە ڕۆژنامـە عەرەبییـەکاندا بڵاوکرابونەوە کە ئەوانیش هەر مام جەلال نوسیبوونی. بۆیـە بەپێویسـتمانزانی بـەزمانی شـیرینی کوردیـش بخرێنە بەردەست‌و دیدی خوێندەوارانی کورد.

جەوهەر کرمانج

# کوردستان.. فیدرالییەکی بالایە..
# زۆرانبازی لەگەڵدا ناکرێ
## -بەشی یەکەم-

ئەو فیدرالییەی لەکوردستان هەیەو گەلی کوردستان داوای فراوانکردنی دەکات بۆ ئەوەی هەموو ناوچەکانی کوردستان بگرێتەوە (نەك هەموو کورد) بەگوێرەی ئەو رێککەوتنە کۆنەی کەفیدرالیەت هەموو ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کەزۆرینەن، وەك چۆن لەیاسای ئۆتۆنۆمی ساڵی (١٩٧٤)ی بەغدا هاتووە. عیراقی رەسمی دانی بەئۆتۆنۆمی نابوو بۆ ناوچەی کوردستان نەك بۆ کورد، بەو مەرجەی کوردستان هەموو ئەو شوێنانە بگرێتەوە کەزۆرینەیان کوردن.

ئەم بڕیارە رەسمییەی عیراق پشتگیرییەکی جەماوەریی لێکراو هەموو حزبە عیراقییەکانیش بەحزبەکانی ئۆپۆزسیۆنی عەرەبی و کوردستانییەوە پشتگیرییان لێکرد.

هەروەها پشتیوانی عەرەبیشی وەرگرت کە لەسەرکردەی نەمری عەرەب جەمال عەبدولناسرەوە بەبروسکە بەناوبانگەکەی دەستیپێکرد کە بۆ سەرکۆماری عیراقی ناردبوو و دەستخۆشی و پیرۆزبایی و پشتیوانی لەبەیانی ئازار کردبوو کەتیایدا دان بەئۆتۆنۆمیدا دەنێ، هەروەها دەڵێ گەلی عیراق لەدوو نەتەوەی سەرەکی پێکهاتووە کە نەتەوەی

عەرەب و نەتەوەی کوردە، هەروەها دان بەمافی گەلی کورددا دەنێ لەئۆتۆنۆمیدا.

هەروەها ئۆتۆنۆمی لەلایەن کۆنگرەی نەتەوەیی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بەسەرکردایەتی سەرۆکی نەمر حافظ الاسد دانی پێدانرابوو، وێڕای ئەوەی کەراستڕەوەکان (یمین)ی بەعس بەر لە (جوولانەوەی راستکردنەوە-الحركة التصحيحية) دژی بوون.

هەروەها لەلایەن لیبیاشەوە پیرۆزکرا کەسەرکردەی شۆڕشەکەی، برای سەرکردە معمر القزافي بەردەوام بانگەشەی مافەکانی گەلی کوردستان دەکات لە کوردستانێکی سەربەخۆو یەکگرتوودا.

تەنانەت هیچ حزبێکی پێشکەوتنخوازی عەرەبی و رێکخراوێکی ئازادیخوازی فەلەستینی لەو پشتگیریکردنەی بەیانی ئازار دوانەکەوت کەمافی گەلی کورد لەئۆتۆنۆمی دیاردەکات، هەروەها پشتیوانی دەولیشی لێکراو یەکێتی سۆڤیەت و هەموو ولاتانی ئەوروپای خۆرهەلات پیرۆزباییان لەو رێککەوتنەو مافی گەلی کورد لەئۆتۆنۆمیدا کرد.

هەروەها لەلایەن حزبە شیوعییەکان و سۆشیالیستەکان و کرێکارییەکان و سەرجەم ولاتانی ئەوروپاو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لێکرا.

دواتــر ياســاى ئۆتۆنۆمــى لــه ١١/ئــادارى/١٩٧٤ دەرچـوو، ئەگـەرچى كـەموكورتى زۆرى تێدابوو، بــەڵام ئەم حەقيقەتانـەى خـوارەوەى بەياسـايەكى رەسمـى لـە (ئەنجومەنى سەركردايەتى شۆڕشەوە) سەلماندبوو:

١-بوونى هـەرێمى كوردستانى ئۆتۆنـۆم، واتـە بوونـى كيانێكى كوردستانى خاوەن ئۆتۆنۆمـى لـەچوارچێوەى يەك عێراقدا، كەپێكدێت لەپارێزگاكانى دهـۆك و هـەولێرو سلێمانى، كە گەلێ ناوچەى كوردستانى لێ بەدەركرابوو.

٢-پێكهێنانى ئەنجومـەنێكى ياسـادانان بـۆ هـەرێمى كوردستـان كـەوەك ئەنجومـەنێكى پەرلـەمانى بـوو دەبـوو بۆ هەرێمى كوردستان هەڵبژێردرێ.

٣-بەڵام كێشە لەنێوان گەلى كوردو حكومـەتى بـەعس لەســەر ســنوورى هـــەرێمى كوردســتان و دەســەڵاتى ئۆتۆنۆمــى هــەر مايــەوە، كێشــەى ســەرەكى لەســەر كـەركوك و خانـەقين بـوو، ئـەو دەمـە سـەدام حسـێن-ى جێگـرى سـەرۆكى عـيراقى ئامـادەيى دەربـڕى لەسـەر دابەشـكردنى كـەركوك بـەپێى رووبـارى (خاسـە) كـە بەناوەڕاستى كەركوكدا تێدەپەڕێ، بـەڵام لايـەنى كوردى ئـــەم پێشـــنيازەى رەتكـــردەوەو داوايكـــرد كـــار بەسـەرژمێريى (١٩٥٧) بكـرێ سـەبارەت بەكـەركوك وەك جێبــەجێكردنێكى ياســاى حكومـــەت كـــە دەڵـــێ كوردسـتانى ئۆتۆنـۆم هـەموو ئـەو ناوچانـە دەگرێتـەوە كەزۆرينـەيان كـوردن، ئــەو ســەرژمێرييەى (١٩٥٧)ى كـەركوك ئـەو راسـتييە دەردەخـات كـەكورد زۆرينـەن

لەپارێزگای کەرکوک کەژمارەیان (١٨٧٥٩٣) کەسەو ژمارەی تورکمانیش (٨٣٣٧١) کەسن.

بەڵام وێڕای ناکۆکییەکان واقیعێکی نوێ هاتەپێش ئەویش بوونی رەسمیی ناوچەی ئۆتۆنۆمییە بۆ کوردستان، واتە بوونی کیانی رەسمیی کوردستانیی خاوەن ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی عیراقێکی یەککگرتوودا.

ئێستا ئەم راستییە دیارە لەلایەن هێندێکەوە تووشی گێل بوون یان خۆ لێ گێلکردن دەبێ، بەتایبەتیش ئەوانەی دژی فیدرالین، بۆیە پێویستە بەردەوام روونبکرێتەوەو دووپات بکرێتەوەو باسبکرێ، بەڵکو وەبیرهێنانەوە بۆ ئیمانداران بەسوودبێ.

کەواتە داواکردنی فیدرالی لەسفرەوە دەست پێناکات، بەڵکو لەڕاستییەکی هەبووو بەڕەسمی دان پێدانراوی عیراقیو میللی، هەروا عیراقیو عەرەبیو دەولی لەسەر ئاستی حکومەتەکانو حزبەکانو دامەزراوەکان، ئەم داواکارییەش لەبڕیاری ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان بەتێکڕای دەنگ گەلاڵەبوو، ئەمە لەکاتێکدا کوردستان لەچنگو دەسەلاتو بوونی حکومەتی عیراقی بەدەربووو لەحاڵەتی سەربەخۆییدا دەژیا، سەربەخۆیی ئەمری واقیع، کەئەمەش دوو راستیی دەسەلمێنێ:

١-پابەندبوونی گەلی کوردستان بەیەکێتیی نیشتمانیی راستەقینە کە لەسەر بنەماکانی دیموکراسیو فیدرالی دامەزرابێ.

٢-سووربوون لەسەر مانەوە لەچوارچێوەی عیراقی یەککگرتووو رێکخستنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ناوەند لەسەر بنەمای فیدرالی کەمافەکانی سەروەری دەداتە حکومەتی ناوەندو ئەوانی دیکە دەداتە ناوچەی کوردستانی فیدرال، مافەکانی سەروەریش؛ سەرۆکایەتی دەوڵەت، هێزی چەکدار، پەیوەندییەکانی دەرەوە، دارایی گشتی، بازرگانیی دەرەوە، سامانە نیشتمانییەکانی وەك نەوتو گازو دراوو بانکی ناوەندی، دەگرێتەوە.

گەلی کوردستان لەماوەی زیاتر لە (١٢) ساڵە مافەکانی فیدرالی پیادە دەکاتو سەرکەوتنی گەورەشی لەهەموو بوارەکانی ژیانی ئابووریو سیاسیو فەرهەنگیو کۆمەڵایەتیو هیدی بەدەستهێناوە، هەزاران گوندی سەرلەنوێ ئاوەدانکردەوە کەدیکتاتۆریەت رووخاندبوونیو درایەوە دەست ئەو جوتیارانەی کەخاوەنی شەرعییان بوون، هەروەها دەستی بەبنیاتنانەوەی شارو شارۆچکە رووخاوەکانی کردەوە بەتایبەتیش هەڵەبجە کە بەچەکی کیمیایی بۆمبارانکرابوو، لەئەنجامدا هەزاران کەس لەدانیشتووانە بێ دیفاعو بێ گوناهەکەی کوژرانو بریندداربوون، هەروەها پێنجوێنو چوارتاو قەڵادزەو چۆمانو گەلاڵەو مێرگەسۆرو بلەو شیروانەو چەندین شارۆچکەی دیکەی کوردی.

هـــەروەها ئیـــدارەو هـــێزی پۆلیـــس و ئاسایشـــی ڕێکخست بۆ ئەوەی ئەو ئارامییە بەرچاوە لەکوردستان بخولقێنێ و کاروباری خەڵك و ئیشوکاریان بەڕێوەببات و خزمـەتی بەرژەوەندییـەکانیان بکـات، هـەروەها زانکـۆی دهـــۆك و کۆیســـنجق دامـــەزران و زانکـــۆی ســـلێمانی سـەرلەنوێ زیندووکرایـەوە کـەڕژێمی دیکتـاتۆریی وەك تۆڵەســـەندنەوە لەشـــاری خەباتکـــەری ســـلێمانی نەیهێشـتبوو، هـەروەها دەیـان پەیمانگـەی هونـەری و تەکنیکی و فێرخوازی لەسەرتاسەری کوردستانی عیراق دامەزراند.

پێمـان باشـە لـەبواری تەندروسـتی و گەشـەکردنیدا لـەماوەی ئـەم دوانـزە سـاڵەی حوکمڕانیـی هـەرێم لەناوچەی سلێمانیدا هێندێ ژمارە بخەینەڕوو:

١-ژمـارەی پزیشـکەکان سـاڵی (١٩٩١) واتـە دوای حەفتا ساڵ لەحوکمڕانیی نـاوەند (١٧٨) پزیشـك بـوو و ئێستاکە ژمارەیان (١١٢٥) پزیشکە، هەر لـەماوەی ئـەو حـــەفتا ســـاڵەدا حکومـــەتی نـــاوەند (٣٥) بنکـــەی تەندروستی دروستکردبوو، بەڵام ئێستا (٤٦٢) بنکـەی تەندروســـتی هەیـــەو لەســـەردەمی کۆنـــدا حـــەوت (٧) نەخۆشـــخانە هـــەبوون، ئێســـتا (٢٧) هەیـــە، ئێســـتا (١٣٢٠٠) بریـــن پێـــچ و پەرســـتارو فەرمانبـــەری تەندروستی و فەرمانبـەری ئیـداری هەیـە، لەبەرامبـەر (٣٢٢٠) فەرمانبـەر لەسـەردەمی کۆنـدا، بـەم جـۆرە دەبینـین جیاوازییـەکی فراوانـی خزمەتگوزارییـەکانی

حکومەتی هەرێم لەناوچەی سلێمانیدا لەماوەی (١٢) ساڵدا هەیە لەگەڵ ئەوەی کەحکومەتەکانی عیراقی لەماوەی حەفتا ساڵدا بۆ ناوچەکەیان کردبوو. هەمان گەشەکردن لەهەردوو ناوچەی دهۆك و هەولێریش دەبینین.

لەبواری خوێندنەوەش حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عیراق لەماوەی حەفتا ساڵدا لەهەرێمی کوردستان (سلێمانی) (٤٠٤) خوێندنگای سەرەتایی و ناوەندیی و ئامادەیی دروستکردبووو زانکۆی سلێمانیشی هەڵوەشاندبووەوە، کەچی ئێستا لەناوچەکەدا (١٩٨٠) خوێندنگا هەن، بەباخچەی ساوایانەوەو، سەرەتایی، ناوەندی، ئامادەیی، پەیمانگە، کەژمارەی خوێندکارانیان (٤١٢٣٧١) خوێندکارە، کەچی ژمارەکە لەساڵی (١٩٩١) (٢٢٠٨٨٦) خوێندکاربوو، ژمارەی مامۆستاکانیشیان (٢٢٤٨٦) مامۆستایە، لەکاتێکدا ساڵی ١٩٩١ ژمارەیان (٧١٧٠) مامۆستا بوو، ئەو ژمارانەش دووقاتی ژمارە کۆنەکانن.

هەروەها زانکۆی سلێمانی سەرلەنوێ دامەزرێندرایەوە کەئێستا کە بەدانپێدانانی هەمووولایەك بەیونسکۆو زانکۆکانی ئەوروپایی و ئەمریکیشەوە کەسەردانیان کردووە، باشترین و پێشکەوتووترین زانکۆیە لەهەموو عیراقدا.

ئەم زانکۆیە (٢٠) کۆلێژی هەیەو (٦٤) بەشی تێدایەو (٤٠٦) مامۆستای هەیەو ژمارەی خوێندکارەکانی (٧٩٦٦) خوێندکارە، چەند بەشێکی ناوخۆیی خۆڕایی هەیە کەسێ هەزار خوێندکاری کوڕو کچی بەخۆوەگرتووە، وێڕای ئەوەش کەهەر خوێندکارێکی کوڕو کچ مانگانە مووچەیەکی گونجاو وەردەگریٚو سەدان کۆمپیوتەرو تۆڕی ئینتەرنێتی پێشکەوتووی هەیە.

هەروەها شەش پەیمانگەی تەکنیکی هەیە بە (٣٠) بەشەوە کەژمارەی مامۆستاکانیان (٥٣)و ژمارەی خوێندکارەکانیشیان (٢١٦٨) خوێندکارەو لەبەشەکانی ناوخۆییاندا جێگای (٦٧٢) خوێندکاری کوڕو کچ دەبێتەوە.

سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە رادەکێشین کەئەوانەی باسمانکردن ئاماری ساڵی (٢٠٠٢-٢٠٠٣)ی خوێندنە، بەڵام ساڵی (٢٠٠٣-٢٠٠٤)ی خوێندن ئەوا گومانی تێدانییە کەپێشکەوتن و گەشەکردن و زیادبوونی لەهەموو بوارەکانەوە بەخۆوە بینیوە.

خۆ ئەگەر خوێندن و تەندروستی دوو نموونەی گەشەکردن و پێشکەوتن و ئەو جیاوازییە فراوانە بن لەنێوان سەردەمی دیکتاتۆریی کۆنەپەرستی عیراقی و سەردەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئەوا هەمان پێشکەوتن و گەشەکردن لەهەموو بوارەکانی دیکەی ئاوەدانی و رێگاوبان و هاتووچۆو تەلەفۆن و مۆبایل و

بازرگـانی و ئـابووریی ئـازادو بووژانـەوەی فەرهـەنگی و ئابووری...تاد، هەیەو هەستی پێدەکرێ.
هـەموو ئەوانە ئەوە دەسـەلمێنن کـەدەبێ گـەلی کـورد چێـژ لـەفیدرالی (یـەکگرتوویی) وەربگـرێ وەك مـەرجێکی پێویسـت بـۆ پێشـکەوتن و گەشـەکردنی کۆمەڵایـەتی و فەرهـــەنگی و سیاســـی و زانســـتی و تەندروســـتیش، هـەروەها حکومەتـە هەرێمییەکـەمان ئەو کارگـە کەمانـەی کە لەکوردستاندا هـەبوون سـەرلەنوێ بەگـەڕی خسـتنەوە کەسیاســـەتی شـــۆڤێنی و ڕەگەزپەرســـتی نەتـــەوەیی هـەوڵیدا کوردستانی لێ بێبـەش بکات، کـە لـەنێو سـەدان کارگەدا کەمتر لە (١٠) کارگە لەکوردستاندایە!
لەکوردســتانی ئـازاددا ژیـانی سیاســی و حزبیــش گەشــەیکردووەو هـــەموو کەســێك چێــژ لــەئازادی و دیموکراســی وەردەگــرن، تیــایدا بــۆ هــەمووان مــافی بلاوکردنـەوەو ڕێکخسـتن و ڕاگـەیاندن و خـاوەنداریێتی رادیــۆو تەلــەفزیۆن تەنانــەت میلیشیاشــیان بــۆ دەستەبەرکراوە.
بازرگـانی و کـاری ئاوەدانکردنـەوە لەسـەر بنـەمای ئابووریی ئازادو بەهاوکاری و هاندانی حکومەتی هـەرێم چالاك بـووو هـەموو پـرۆژە پیشەسـازییە بچووکـەکان و جووڵانــــــەوەی بنیاتنــــان و ئاوەدانکردنــــــــەوە گەشەیانکردووە.
هەروەها ژیان بۆ لادێکان گەڕایەوە کـە سـەدام حسـێن بەتـەواوەتی کـاولی کردبـوون، بـەجۆرێ گونـدو کێڵگـەکان

ویرانکـران و چـەندین ملیـۆن سـەر مـەڕو مـاڵات بـەتاڵانبردران و کشـتکاری قەدەغـەکرا، زۆربـەی زۆری گوندەکـان دروسـتکرانەوەو ژیـانی کشـتکاری بـۆ گێڕدرایـەوەو زۆربـەیان کارەبـاو پـرۆژەی ئـاودێری و تەندروستییان بۆ بردراو سامانی ئاژەڵیان بۆ گەڕایەوەو ژمارەیـان لـە بەرلەتاڵانەکـە تێپـەڕی کـە بـەبیانووی ئەنفالـەکان تـاڵانکرابوون. شـاری سـلێمانی-ش بـووە جوانترین و پاکترین شاری عیراق.

هـەموو ئـەو حەقیقەتانـە زیانـەکانی دیکتاتۆریـەت و سـوودەکانی دیموکراسـی بـەئیدارەی فیدرالییـەکی (یـەکگرتوویی) دەسـەلمێنن، ژیـانی هاوولاتیـان باشتربووو مووچە بەرێژەیـەکی زۆر زیادبووو گوزەرانی کاسـبکارو کرێکـاران باشـتربووو ئیـدی کێشـەی بێکارییان نییـە، هـەروەها مافـەکانی ژنـان گەشـەیکردو دان بـەمافی یەکسـانییان نـرا لەگـەڵ پیـاوان و بوارەکـان لەبەردەمیاندا کرانـەوەو ئێسـتا وەزیـرو جێگری وەزیـرو بەڕێوەبـەری کارگـەو قایمقـام و حاکمیـان لـەدادگاکاندا هەیـەو یاسـای قەدەغـەکردنی فرەژنـی دەرچـووو بـەناو یاسـای شـەرەف هەڵوەشـێندرایەوە کەکوشـتنی ژنـانی لەلایەن کەسوکاریانەوە بێ دادگاییەکی عادیلانە حەڵاڵ کردبوو.

هـەروەها جووڵانـەوەی وەرزش لەکوردسـتان فـراوان بـووەو یانـەکان و تیپـە وەرزشـییەکان چـالاك بـوون و

پشتیوانیی ماددی لە حکومەتی هەرێم وەردەگرن و لەزۆر شاراندا بینایان بۆ دروستکراوە.

هەرچی بوارەکانی سیاسیی و فەرهەنگییشە ئەوا ئازادی تەواو هەیە، هەموو حزبەکان بەئازادییەکی رەها کاردەکەن و رێکخراوی دیموکراتیی دامەزرێندران کە بەوپەڕی ئازادی چالاکی دەنوێنن بەدەیان رۆژنامەو گۆڤار بێ سانسۆرو بەوپەڕی ئازادی دەردەچن.

هەروەها دەزگای فەرهەنگیی وەك دەزگای سەردەم و گەلاوێژی نوێ لەسلێمانی و دەزگای لالش و هیدی لەهەولێرو دهۆك دامەزراون و جوولانەوەی ئەدەبی و هونەری و شانۆیی لەکوردستان فراوانبوون و ئێستگەی تەلەفزیۆنی ناوخۆو نیشتمانی و جیهانی لەتەك چەندین ئێستگەی رادیۆی سەر بەحزب و رێکخراوەکان دامەزرێندران.

بەکورتی کوردستان بووە مێرگی ئازادی و دیموکراتیی و گەشەکردن و پێشکەوتن لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، بەجۆرێك دەشێ ببێ بەنموونەیەك بۆ عیراقی دیموکراتیی نوێ، ئەمەش راستییەکە هەموو دانی پێدادەنێن، ئەوانەش کەسەردانی کوردستان دەکەن.

کەواتە ئەم ئەزموونە دیموکراتییە پێشەنگەی (فیدرالی دیموکراسی کوردستانی) شایانی پشتگیری و هاندان و پیرۆزکردنە لەلایەن سەرجەم خێرخوازانی عیراق و هەموو ئەوانەی تامەزرۆی ئازادی و

دیموکراسین لەعیراق‌و ناوچەکەدا، بەڵام هێندێ نەزان‌و خۆگێلکەری ئەو راستییانە هەن کە لەژێر کاریگەریی چەمکی شۆڤێنیستی دژ بەگەلی کورددان‌و دەیانەوێ ئەم ئەزمونە دیموکراتییە بڕوخێنن لەجیاتی ئەوەی بەسەر هەموو عیراقدا جێبەجێی بکەن‌و پێبیگەیەنن‌و زیاترو زیاتر گەشەی پێ بدەن.

ئەوانە لەوانەن کەدژی فیدرالین بۆ هەموو عیراق نەك هەر کوردستان بەوەش سەری خۆیان لەبەردی چیاکانی کوردستان دەدەن‌و دژایەتی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و ئابووری دەکەن‌و کار بۆ بڵاوکردنەوەی دوژمنکاریی‌و رق‌و کینە دەکەن لەنێوان کوردو عەرەب، بەتایبەتیش لەنێوان ئەو کوردو عەرەبانەی کەدژی مافەکانیانن لەدیموکراسی‌و فیدرالیدا.

ئەوانە بێهوودە دەیانەوێ رەورەوەی مێژوو بەرەودواوە بگەڕێننەوەو تاریکی بەسەر کۆمەڵگایەکی گەش، گەش بەڕووناکی ئازادی‌و دیموکراسی‌و فیدرالیدا بسەپێنن.

ئەوانە دەیانەوێ دەستکەوتەکانی گەلی کوردستان زەوتبکەن‌و مافە بەدەستهێنراوەکانیان تالان بکەن‌و ئەو پێشکەوتن‌و شارستانیەت‌و کۆمەڵگا مەدەنییە نوێیەی لێ بڕوخێنن کەبەدیهێناون، بەڵام ئەو خەونانەیان پووچەو هیواکانیان مەحاڵە، هەروەها دەمانەوێ وتارەکەمان بەدەقی ئەو بڕیارە پشت راست بکەینەوە کەکۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی لەلەندەن بەتێکڕای

دەنـــگ‌و دواتریـــش پشـــتگیری هـــەردوو حکومـــەتی ئەمریکی‌و بەریتانی‌و سۆسیالیستی دەولی دەرچوو:

*دەیەم: فیدرالیەت‌و چارەسەری کێشەی کورد:

کەکێشـــەی کـــوردو رێگاچـــارە چاوەڕوانکراوەکـــانی دەخرێنـــە بـــەر لێکۆڵینـــەوە، کۆنگـــرە جـــەخت لەســـەر راستیی ئـــەو جیـــاوازیی‌و فرەیـــی پێکهاتـــەی کۆمـــەڵگای عیراقی نەتـەوەیی‌و مەزهـەبی‌و سیاسـی کردەوەو لەسـەر ئـــەوەش کـــۆك بـــوون کـــە یـــەکێتیی نیشـــتمانیی ئارەزوومەندانـــە پتـــەوو تۆکمـــە بکـــرێ، ئـــەویش بەهێنانـــەدی یەکســـانییەکی تـــەواو لـــەنێوان هـــەموو هاوولاتیـــاندا، بەلەبـــەرچاوگرتنی ئـــەو بڕیارانـــەی کۆنگرەی سەلاحەددین‌و کۆبوونـەوەکانی ئۆپۆزسیۆنی عـیراقی‌و گوتـاری سیاسـی کۆبوونـەوەی سـەرکردایەتی ئۆپۆزسیۆن لەواشنتۆن لـەمانگی ئـابی (٢٠٠٢)داو ئـەو پـرۆژە فیدرالییـە تـەواوەی کـە ئەنجومـەنی نیشـتمانیی کوردستان لـە (٧/ت شـرینی دووەمـی /١٩٩٢)دا گرتیـە ئەستۆ، کۆنگرە رێزی خۆی بۆ گـەلی کوردستان‌و ئیرادە ئازادەکـــەی دەربـــڕی لەهـــەڵبژاردنی ئـــەو شـــێوازە گونجاوەی لەگـەڵ رۆڵـەکانی یـەك نیشـتماندا، هـەروەها کۆنگرە هەڵوەستەی لەسەر ئەزموونـەکانی فیـدرالی کـردو پێـی وابـوو شێوازێکی گونجاوە بـۆ حوکمڕانیـی عـیراق‌و پێویستە وەك بناغەیـەك بـۆ چارەسـەری کێشـەی کـورد لـەچوارچێوەی دەزگـا دەسـتوورییە عیراقییـەکاندا دوای

رووخـاندنی رژێمـی دیکتـاتۆریی سـەدام‌و گۆڕانکارییـە چاوەڕوانکراوەکاندا پشتی پێ ببەسترێ.

لـەم روانگەیـەوە کۆنگرە پەرۆشیی خۆی بۆ یـەکێتی عـیراق‌و پێکـەوەژیانی نەتـەوەکانی دەربـڕی لەسـەر بنـەمای یـەکێتی ئارەزوومەندانـەو کۆبوونەوەکـە جـەختی لەسـەر بەدیـهێنانی داخوازییـە رەواو عادیلەکـەی گـەلی کوردسـتان‌و نەهێشـتنی دیـاردەی چەوسـاندنەوەو داپڵۆسین کردەوە بەپێی مـەبدەئی یاسایی نێودەوڵـەتی کـە دان بەمافەکانیدا دەنێ لـەدیاریکردنی چـارەنووس‌و سـەلماندنی گیـانی برایـەتی‌و یـەکێتی‌و هاوبەشـیی لەنیشتماندا.

لـەکۆتاییدا دەڵێـین فیدرالیـەت بەئەنقەسـت لەلایـەن رەگەزپەرسـتاندا شـێوێندراوەو حـەرام کـراوە، چونکـە فیدرالیـەت مانـای یەکگرتنـە -ئـەڵمانیای فیـدرالی- بەئەڵمانیای یـەکگرتوو نـاودەبرێ، هـەروەها فیدرالیـەت بەم واتایە یـەکگرتن دەگەیـەنێ نـەك دابەشـکردن، بـەڵام یـــەکگرتنێکی ئارەزوومەندانەیـــە، یـــەکگرتنێکی دیموکراتییـە رێز لەویستی خـەڵك‌و مافـەکانیان دەگـرێ بـــۆ حوکمڕانیکردنـــی ئـــەو ناوچانـــەیان کـــە بەتایبەتمـەندێتی خۆیـان جیاوازییـان هەیـە، فیدرالیـەت لـەمێژوودا بـۆ یەکخسـتنی هەرێمـەکانی یـەك نەتـەوە هـاتووە، وەك ئـەڵمانیا، یـان بـۆ یەکخسـتنی ئـەو هەرێمانەی نەتەوەی لێك جیاواز تێیدا نیشتەجێن، وەك کەنـەداو سویسـرا، یـان بـۆ یەکخسـتنی ئـەو هەرێمانـەی

تایبەتمەندێتییەکی دیاریکراویان هەیە وەك هیندو پاکستانو ئوسترالیا، کەواتە فیدرالیەت پرۆسەیەکی یەکگرتنە نەك دابەشکردن.

هەروەها فیدرالیەت پیادەکردنێکی دیموکراتییانەیە بۆ بەشداریپێکردنی هەمووان لەحوکمڕانیکردنی ولاتەکەیانو بۆ ئەوەی ئازادبن لەهەلبژاردنی حاکمەکانیانو هەلسوڕاندنی هەرێمە تایبەتییەکانیان، فیدرالیەت دابەشکردنی دەسەلاتە لەنێوان ناوەندو هەرێمەکان بەوەش کۆتایی بەناوەندێتی زێدەڕۆ دێنێ کەهەموو دەسەلاتەکان لەدەستی ناوەند کۆدەکاتەوەو وەك دیکتاتۆریەتو مۆنۆپۆل توندکردنی دەسەلاتەکانو مافە ئیدارییەکانو هی دیکەشە.

لەدواییشدا فیدرالیەت پیادەکردنێکی هاوچەرخو شارستانییە بۆ حوکمڕانیکردنی دەولەتێکی خاوەن هەرێمی جیاواز یان فرەنەتەوە، بەم جۆرە شۆڤێنیستەکان خۆیان لەو حەقیقەتە ئاشکرایانە گێل دەکەن بۆ ئەوەی فیدرالیەت (یەکگرتوویی) بکەنە دەعبایەکی ترسناكو خەلکی سادەو ساکاری پێ بترسێننو هەلیانبخەلەتێننو مێشکیان ژەهراوی بکەن.

# بۆ بەرژەوەندیی عیراق و پتەوکردنی یەکێتییە نیشتمانییەکەی

# کامیان هەڵبژێرین؛ بەزۆر پێوەلکاندن یان یەکێتیی ئارەزوومەندانە؟

## -بەشی دووەم-

### (کاکڵەی پێولکاندن لەبۆچوونی دیموکراسیدا)

کاکڵەی پێوەلکاندن ئەمەیە:

١-بەناڕەزایی، یان بەناچاری، یان بەزەبروزەنگ گەلێك یان خاکێکی بێگانە بخرێتە سەر وڵاتانی گەلێکی دی.

٢-گەلێك و خاکێکی بێگانە بخرێتە سەر وڵاتی گەلێکی دی بێ ئەوەی راپرسییەکی ئازاد بکرێ و رەزامەندیی ئەو گەلە وەربگیرێ کە بەو دەوڵەتەوە لکێندراوەو حوکمڕانیی دەکات و بێ ئەوەش بەدەنگدانێکی ئازاد ئەم پێوەلکاندنەی هەڵبژاردبێ.

٣-هێشتنەوە یان دەستبەسەرکردنی گەلێك لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی فرە نەتەوە یان بەزۆرداریی و بێ ئەوەی مافی دەنگدانێکی ئازاد بەئیرادەیەکی ئازادەوەی پێ بدرێ بۆ ئەوەی بەتەواوی ئارەزووی

خۆی شێوەی کیانی سیاسی خۆی دوای دەرچوونی هێزی نەتەوەی حوکمڕانیکەر لەخاکی ئەو گەلە هەڵبژێردرێ، تا ئیختیارەکەی ئازادو راستەقینەو راستگۆیانە بێت.

٤-رەتکردنەوەی مافی ئەو گەلە لەدیاریکردنی چارەنووسی خۆیو بێبەشکردنی لەپێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوەیی خۆیو دەستنیشانکردنی سنووری دەوڵەت بەپێچەوانەی ئارەزووی دانیشتووان، ئەو پێوەلکاندنە بەزاندنی ئازادی گەلە لەدیاریکردنی چارەنووسی خۆیو بەزاندنە بۆ مافی دەستنیشانکردنی شێوەی ئەو کیانە سیاسییەی خۆی دەیەوێ، هەروەها ناچارکردنی گەلێکی زوڵم لێکراوو بێبەشکراوە لەمافە نەتەوەییو دیموکراتییەکانی بەهێشتنەوەی لەچوارچێوەی ئەو وڵاتەی حوکمڕانیی دەکات، قەدەغەکردنی مافەکانی گەلێکی زوڵم لێکراوە لەپێکهێنانی دەوڵەتێك بۆ خۆی، یان هەڵبژاردنی بەئازادیی ژیان لەیەکگرتنێکی ئازاد لەگەڵ هەر نەتەوەیەك خۆی بیەوێ.

### زیانەکانی پێوەلکاندنو بۆچی دیموکراسی دژیەتی؛

پێوەلکاندن کەدەستکردی داگیرکردنو ئیستعمارەو دەستبەسەرداگرتنی خاکی گەلێکی زوڵم لێکراوە، زیانی لەرادەبەدەر بەمافەکانیو برایەتی گەلانو هاوکارییو هاوخەباتیی کرێکارو رەنجدەرانو گەلانی خەباتگێری دژ بەئیستعمارو کۆنەپەرستی دەگەیەنێو

کۆسپ بۆ گەشەکردن و ئازادیی بەتایبەتیش بۆ گەلانی زوڵم لێکراو دروست دەکات، هەروەها بۆ سەرجەم نەتەوەی حوکم بەدەست کەناتوانێ ئازادبێ، مادام نەتەوەی دیکە دەچەوسێنێتەوە، بۆ زیاتر روونکردنەوەش دەڵێین:

١-پێوەلکاندن کۆسپ دەخاتە بەردەم ئازادیی نیشتمانیی. نەتەوەی زوڵم لێکراوو مافی چارەی خۆنووسینی لێ زەوت دەکات، بەمەش تەگەرە بۆ ئازادبوون و سەربەخۆیی و ئازادیی سیاسی و فەرهەنگی دروست دەکات، بەڵام سەبارەت بە نەتەوەی حوکم بەدەست ئەوا پێوەلکاندن ئازادییەکەی و رزگاربوونی لەکۆت و پێوەندی دیکتاتۆری و کۆنەپەرستی سنووردار دەکات، چونکە زۆرجاران چینی باڵادەستی نەتەوە ئەم پێوەلکاندنە دەکاتە هۆکارو بیانوو بۆ سەپاندنی دیکتاتۆریەت یان کۆت و پێوەندی کۆنەپەرستانە یان کردەوەی داپڵۆسێنەرانەی پێچەوانەی دیموکراسی بەجۆرێ کەهەموو وڵاتان دەگرێتەوە، لەبەر ئەوە گەلێك گەلانی دی بچەوسێنێتەوە ناتوانێ بەتەواوی ئازادبێت.

٢-پێوەلکاندن تەگەرە بۆ گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی نەتەوەی حوکمکراو دروست دەکات و کۆسپ دەخاتە بەردەم نەشونماکردن و شارستانیەت و بەمۆدێرنکردن و بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و زانست و هونەر، بەڵام سەبارەت بەخودی دەوڵەتەکە ئەوە مێژوو سەلماندوویەتی و تاقیکردنەوەی

ولاتــه جیاجیاکـــان نیشـــانیانداوه چـــۆن دەوڵـــەتی نەتـــەوەیی لەگـــەڵ گەشـــەکردنی ســـەرمایەداریو کۆمەڵایـــەتیدا دەگونجـــێ کـــه لـــەکاتێکدا دەوڵـــەتی فرەنەتـــەوە کـــەمتر پێشـــکەوتنو شارســـتانی بـــەخۆوە دەبینێ.

٣-ئـەو پێوەلکاندنـەی لەبنچینـەدا لەسـەر زوڵـمو زۆری نەتـــەوەییو چەوســـاندنەوەی نەتـــەوەییو ئیمتیـــازاتی نەتەوەیـــەك لەســـەر نەتەوەیـــەکی دیو بێبەشکردنی گەلێك لەدیاریکردنی چارەنووسی خۆیو لەدەســەڵاتو ئیمتیازەکـانی دادەمـەزرێ، رقو کینـەو لێکدابـڕانو دواتریـش دوژمنداریـــی لـــەنێوان گـــەلانی حاکمو حوکمکراو دروست دەکاتو سـەرەنجام دەبێتـه مایـەی نـاکۆکیو شـەڕو شـۆڕو نەگەیشـتنەیەكو کینـە دروستکردن.

٤-پێوەلکاندن رێگە لەهاوپەیمانێتیی خەباتکارانەی پتـەو دەگـرێ، یـانیش کۆسـپ بـۆ خـەباتی هاوبـەش لـەنێوان گـەلانی زوڵملێکـراوو زاڵـم دروسـت دەکـاتو دەبێتـه کۆسـپێکی گـەورەش لەسـەر رێگـای سـەرکەوتن بەسەر ئیستعمارو دیکتاتۆرییدا.

٥-پێوەلکـاندن کۆسـپ بـۆ هاوکـاریی نێـوان چینـی کرێکارو جەماوەری میللی لەنەتـەوەی حوکمکـراوو زوڵـم لێکراوو چینـی کرێکـارو جـەماوەری میللـی لەنەتـەوەی زاڵم یان حاکم دروست دەکات.

٦-پێوەلکاندن دەبێتە مایەی زیادکردنی پێکدادان‌و توندکردنی مەترسی شەڕ لەنێوان نەتەوەکانی حاکم‌و حوکمکراو، لەنێوان نەتەوەکانی زوڵملێکراوو زاڵم، هەروەها لەو ناوچانەش کە ئەو دەوڵەتە فرە نەتەوانەی لێیە.

٧-پێوەلکاندن دەبێتە مایەی بەفیڕۆدانی وزەو توانای گەلانی زوڵم لێکراوو زاڵم پێکڕا بەتایبەتیش لەجیهانی سێیەمداو بەفیڕۆدانی توانای سەربازی‌و ئابووری‌و فەرهەنگی‌و هی دیکە لەشەڕو پێکدادان‌و بەیەکداچوونی نەزۆك کە جگە لەداگیرکەران کەس لێی سوودمەند نابێت، نموونەش لەسەر ئەوە شەڕی کوردی-عیراقی لەزیاتر لەچارەکە سەدەیەکداو شەڕی باشووری سودان‌و ئەریتریا.

٨-پێوەلکاندن لەولاتی فرەنەتەوەدا، یان بەتایبەتیش لەجیهانی سێیەمدا زەمینەیەکی گونجاوو دەرفەتێکی شیاو بۆ ئیستعمار سازدەکات تا گەمە پیسەکەی خۆی بەگوێرەی سیاسەتی (فرق تسد) بکات‌و ئاگری ئاژاوەگێڕی‌و شەڕی ناوخۆی تێدا هەڵبگیرسێنێ‌و هەروەها بەکارهێنانی پێوەلکاندن بەقازانجی سەپاندنی پرۆژەو پیلانەکانی. ئیستعمار گەڵێ پەیماننامەی ناڕەوای بەسەر عیراقدا سەپاند، ئەویش بەقۆستنەوەی لکاندنی کوردستانی باشوور بەدەوڵەتی عیراقی‌و سەپاندنی پەیماننامەی سەعد ئابادو دواتریش پەیمانی بەغدای بەدناو، ئەویش

بەقۆستنەوەی دابەشکردنی کوردستان و بۆ نموونە لکاندنی پارچەکانی بەدەوڵەتەکانی تورکی و ئێرانی و عیراقیدا.

## زیانەکانی پێوەلکاندن لەعیراقدا:

راستە ئیستعماری بەریتانی قازانجێکی زۆری کردو گەلێ مەبەستی ئیستعماریی بەلکاندنی کوردستانی باشوور بەدەوڵەتی عیراقی دەستکردی خۆی وەدیهێنا، بەتایبەتیش لەبوارەکانی ئابووری و نەوت و ستراتیژی و سەربازیی و هی دی، هەر وەك چۆن واقیع ئەوە دەسەلمێنێ. بەڵام گەورەترین زەرەرمەند گەلی کورد بوو کەئازادی و مافەکانی لەدیاریکردنی چارەنووس و پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی و بەکارهێنانی بەروبوومە نەوتی و کشتکاریی و کانزاکانی خۆی لەدەستدا کە لەبەرژەوەندیی گەشەپێدانی کۆمەڵگاکەی خۆیدا بەکاریان بهێنێ، هەروەها جەماوەری میللی زیانی لێکەوت ئەویش بەهۆی لەئەستۆگرتنی خەرجی و قورسایی سەرکوتکردنی شۆڕشەکانی کوردو ئەو ئاکامانەی لەشەڕە زاڵمانەکە کەوتنەوە کەچەندین کارەسات و زیانی مرۆیی و ماددیی بوون و ئاستەنگی خستە بەردەم نەش و نماو گەشەکردن لەعیراقدا، هۆکاری قوربانیدانی ئەو حاکمە زاڵمانە بەچارەنووسی نیشتمان لەپێناو لەناوبردنی شۆڕشی کورد، وەك چۆن سەدام حسێن لەرێکەوتنەکەی جەزائیردا لەگەڵ شای ئێران کردی و خیانەتکردن بەخاکی عیراق یەکێك بوو

لەو هۆکارانەی سەدام حسێن شەڕێکی دوژمنکارانەی کردە سەر ئێرانی دراوسێ دوای ئەوەی کەتازە بەسەر رژێمی دیکتاتۆی شاهەنشایی سەرکەوتبوو، عیراق شەڕێکی دژواری دوژمنکارانەی هەشت ساڵەی بەرپاکرد کە گەلی عیراق جگە لەوێرانکاری و کاولبوون و لەدەستدانی سەدان هەزار لاوی کەبوونە سووتەمەنی ئەم شەڕەو جگە لەکەوتنەوەی دەیان هەزار بێوەژن و سەدان هەزار هەتیوی بێ کەس و جگە لەسەدان هەزار سەقەت و سەدان هەزار پەککەوتەی کارنەکەری بێ بەرهەم، هیچی نەدوورییەوە، ئەمە جگە لەوەی کەسەدان هەزار ملیۆن دۆلار لەم شەڕە نەگریسە خەرجکراو بووەمایەی ئەوەی عیراق بکەوێتە ژێر باری قەرزی دەرەوە کە بەدەیان ملیار دۆلار مەزەندە دەکرێ، هەروەها ئاستەنگی بۆ گەشەکردنی ئابووری و سیاسی و زانستی و تەکنیکیی دروستکردو عیراقی لەوڵاتێکی دەوڵەمەندەوە کردە وڵاتێکی هەژارو وڵاتێکی دواکەوتووی ئەوتۆ کەژێرخانەکەی و هەموو بوارەکانی ژیانی پێوستیان بەنوێکردنەوە هەیە، ئەگەر حکومەتێکی دیموکراتی هەبوایەو دانی بەمافە رەواکانی گەلی کورد نابا لەئۆتۆنۆمییەکی راستەقینە ئەوا بارودۆخەکە پێویستی بەمۆرکردنی ئەو پەیماننامە خیانەتکارییەی جەزائیریش نەدەبوو.

بەم جۆرە ئەو یەکگرتنە لکێندراوەی عیراقی کەئیستعمار سەپاندی و دیکتاتۆریەتی حاکم پابەندی

بوو، سەلماندی کەجگە لەکاولکاریو وێرانکاری، جگە لەشەڕی ترسناکی ناوخۆ، جگە لە لەدەستدانی سەربەخۆیی نیشتمانیو تەنازولاتی خیانەتکارانە بۆ وڵاتانی دراوسێ، جگە لەدواکەوتنو بێبەشبوون لەگەشەکردنی ئابووری، جگە لەمردنی سەدان هەزار عیراقیو بەفیڕۆدانی سەدان هەزار ملیۆن دۆلارو جگە لەهەژارکردنی عیراقو بارکردنی بەقەرزوقوڵەیەکی قورس، هیچی دیکەی لێ نەکەوتۆتەوە.

# بۆ بەرژەوەندیی عیراق و پتەوکردنی یەکێتییە نیشتمانییەکەی

## کامیان هەڵبژێرین؛ بەزۆر پێوەلکاندن یان یەکێتیی ئارەزوومەندانە؟

### -بەشی سێیەم-

### یەکگرتنی عیراق ساڵی (١٩٥٨) لەیەکگرتنی پێوەلکاندنەوە بووە یەکگرتنێکی ئارەزوومەندانە

ئەگەر ئەو یەکگرتنەی عیراق دوای لکاندنی کوردستان بەعیراق بەزەبری هێزی سەربازیی و دەسەڵاتی سیاسیی ئیستعماری بەریتانییەوە پێوەلکاندنێکی بەزۆر بووبێ گەلی کورد ماوەیەکی دووروودرێژ دژایەتیی کردبێ، ئەوا ئەو یەکگرتنەی عیراق دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بووە یەکگرتنێکی نیشتمانیی قبووڵکراو لای گەلی کورد، ئەوەبوو جەماوەری میللی کورد کۆماری عیراقی وەك کۆمارێك بۆ عەرەب و کورد قبووڵ کردو پابەندبوونی خۆی بەیەکگرتنی راستگۆیانەی عیراقی نیشاندا، وەك چۆن خوالێخۆشبوو ژەنەراڵ عەبدولکەریم قاسم-ی سەرکردەی شۆڕشی چواردەی تەمموزی ئازادیخواز گوتبووی.

لەو دەمیدا گەلی کورد بەویستی ئازادانەی خۆی ئەوەی هەڵبژارد کە لەگەڵ گەلی عەرەبی برای بژی، بەتایبەتیش کە لەمادەی سێیەمی دەستووری کۆماری عیراقدا هاتووە:

عەرەب و کورد هاوبەشن لەنیشتماندا، ئەم دەستوورە دان بەمافەکانی گەلی کورددا دەنێ لەچوارچێوەی یەکێتی عیراقدا.

ئەو دەمە پێشڕەوانی گەلی کورد لەپارتی دیموکراتی کوردستان هەوڵیاندا ئەم هاوبەشییە لەئۆتۆنۆمیدا بەرجەستە بکەن کەبڕونامەی هاریکاری نێوان حزبی شیوعی عیراق و پارتیش لەپایزی ١٩٥٨ سەلماندوویەتی.

لەوکاتەوە دیموکراسی بۆ عیراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بووە دروشمێکی سەرەکیی گەلی کورد لەعیراقدا، کەشۆڕشی (٥)ی ئەیلولی رزگاریخوازی کوردیش هەمان دروشمی هەڵگرتبوو، ئەوەبوو دوای هاتنەوە سەر حوکمی بەعس لەساڵی (١٩٦٨) خەباتی گەلی کورد سەرکەوت و هەر لەسەرەتاوە لەکۆبوونەوەکانیاندا لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتی دانیان بەئۆتۆنۆمی نا، تەنانەت بەڕێز میشێل عەفلەقیش خۆی دانی بەو ئۆتۆنۆمییەدا نا کاتێ بۆ یەکەمین جار دوای دەسەڵات گرتنەدەستی بەعس سەردانی عیراقی کرد، دواتر بەعس لەو ڕێککەوتنەی کە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی

خوالێخۆشبوو ژەنەراڵ مستەفا بارزانیدا دانی بەئۆتۆنۆمی هەرێمی کوردستان ناو بەیانی (١١)ی ئاداری ١٩٧٠ دەرکرا بۆ ئەوەی ئەم مافەی گەلی کورد بسەلمێنێ.

## قازانجەکانی یەکگرتنی ئارەزوومەندانە (فیدرالی) بۆ عیراق

مێژووی پەیوەندییەکانی نێوان ئەو نەتەوانەی کە لەسایەی یەك وڵاتدا دەژین، هەروەها یەکگرتنی هەرێمەکانی یەك نەتەوەش لەچوارچێوی دەوڵەتە نەتەوەییەکەیدا سەلماندوویەتی کە یەکگرتنی ئارەزوومەندانە باشترین شێوەی برایەتی و پێکەوەژیانە، هەروەها یەکگرتن (فیدرالی) شێوەیەکی دیموکراتی شارستانیانەیە بۆ بەڕێوەبردنی ئیدارەیەکی هاوچەرخ.

سەیر نییە کە لە (٧٧) وڵاتی جیهاندا فیدرالی هەیە، هەروەها وڵاتان بەرەو ئەوە دەچن دەسەڵاتیان لەنێوان ناوەندو هەرێمەکاندا دابەش بکەن، چونکە ئەوە بۆتە پێداویستییەکی حەتمی بۆ گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی، هەروا بۆ نەش ونماکردن و بووژاندنەوە.

سەبارەت بەعیراقیش کەتێکڕای گەلەکەی بەدەست مەرکەزیەت و بێبەشبوون لەدیموکراسی دەیناڵاند،

فیدرالیی دیموکراتی چاکترین چارەسەری شفابەخشە (دەرمانی هەموو دەردانە) لەعیراقی نوێدا.

با لەکوردستان دوورکەوینەوەو بچینە بەسراو عیمارە کەنەوتێکی زۆریان تێدایەو نزیکەی (٧٠٪)ی داهاتی نەوتی عیراق لەوێیە، کەچی خەڵکی بەسراو عیمارە لەبەر نەبوونی پرۆژەی ئاوی خواردنەوە، ئاوی پاکیان نییە بیخۆنەوە، وێڕای ئەو هەموو دواکەوتن‌و هەژاریی‌و بێکارییەی لەهەموو شوێنەکانیاندا هەیە.

ئەوە ئەگەر مەرکەزیەت نەبوایەو دەسەڵاتەکان لەنێوان پایتەخت‌و هەرێمەکان‌و پارێزگاکان دابەشکرابان، ئەوا خەڵکی ئەم دوو پارێزگایە دەیانتوانی ژیانێکی سەرفرازو شارستانی بۆ خۆیان دابین بکەن، لەتەك ئەوەشدا بەداهاتە پڕ خێروبێرەکانیان بەشدارییان لەهاوکاریی ناوەند دەکرد.

هەموو ئەوانە یەکێتی نیشتمانی پتەودەکەن‌و پابەندبوونی هاووڵاتیان پێیەوە بەهێزتر دەکەن، دەبا هەمان شتیش-وێڕای کێشەی نەتەوەیی-لەسەر پارێزگاکانی کوردستان جێبەجێ بکەین کەسیانیان لەهەرێمێکدا پێکەوە بەستراونەتەوە، ئەویش بەبڕیارێکی عیراقی کە ئەم هەرێمە ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان پێکبێنێ کە لە (١١/ئاداری/١٩٧٤)دا ئەحمەد حەسەن بەکر بڵاویکردەوەو بەبڕیاری (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) رایگەیاند؛

کەئۆتۆنۆمی لەهەرێمی کوردستان جێبەجێ دەکرێ، (لەدەقە رەسمییەکەدا وا هاتووە) یاساکە ناوی یاسای ئۆتۆنۆمی بوو لەهەرێمی کوردستان لەسەر بنچینەی ئەوەی کە "هەرێمەکە زۆربەی دانیشتووانەکەی کوردن و لەسەر بنەمای ئەوەش کەدیموکراسی رێگای زامن بۆ ئەوەدابین دەکات گەلی کوردمان هەموو مافە نەتەوەییە رەواکانی خۆی لەچوارچێوەی یەك نیشتماندا بەرێوەببات، ئەویش لەسایەی پەیوەندیی برایانەو یەکسانی و بەرپرسێتی هاوبەش لەنێوان رۆڵەکانی و پتەوکردنی یەکێتی نیشتمانی" ل٦ی چاپی سێیەمی یاسای ئۆتۆنۆمی هەرێمی کوردستان.

بەم جۆرە ناوچەی کوردستانی ئۆتۆنۆم کرا بەهەرێمی کوردستان، کەهەرێمی کوردستان واقیعێکە سی ساڵە لەعیراقدا بوونی هەیە، جا ئەوە بەناوی ناوچەی کوردستان بێ یان هەرێم، ئایا دوژمنانی فیدرالی دەیانەوێ دەستکەوتەکانی گەلی کوردستان زەوت بکەن کە بەخوێنی دەیان هەزار شەهیدو لەئەنجامی خەباتێکدا کەدەیان ساڵ بەردەوام بوو بەدەستهێناون، تەنانەت حوکمی بەعسی شۆڤێنیش دانی پێداناوە؟!

مەگەر دەیانەوێ لەشۆڤێنیەت و رەگەزپەرستی بەعسی عەفلەقیش تێبپەرێنن؟! بەڵام بەپێچەوانەی راستییەکان، بەعسی لەناوچوو مانای ئۆتۆنۆمی شێواندو ناونیشانەکەی کردە پەردەیەك بۆ شەرێکی

قات‌وقڕکـەر دژی شۆڕشـی کـوردو بـۆ گۆڕینـی واقیعـی نەتەوەیی لەکوردستان، ئـەویش بـەهێنانی هـۆزە عەرەبە شیعەکان لەباشووری عیراق بۆ کوردستان، بەتایبـەتیش بـۆ کـەرکوك‌و خانـەقین بـۆ بەعـەرەبکردنیان بەپلـەی یەکـەم‌و بەپلـەی دووەمیـش بـۆ فیتنـە نانـەوە لـەنێوان کوردو هاوپەیمانە دێرینەکانی لەعەرەبی شیعە.

دوابـەدوای راپەڕینـە مەزنەکـەش، بـەهاوکاریی هاوپـەیمانان کەناوچەیـەکی دژە فڕیـن‌و دژە پـەلاماریان پێکهێنا، هـەرێمی کوردستانی عیراق چێـژی لـەئازادی‌و دیموکراسـی وەرگـرت‌و بـووە قـەڵای ئـازادیخوازانی عـیراق‌و پەناگـە بـۆ ئـەو بـرا عەرەبانـەی کـە لـەدۆزەخی دیکتاتۆریـەت رایـانکردبوو، ئـەوەبوو بـۆ یەکـەمین جـار لـەمێژوودا هـەڵبژاردنی تێدا کرا کەنزیکـەی یـەك ملیـۆن دەنگدەر بەشـدارییان تێداکـردو سـەرەنجام ئەنجومـەنی نیشـتمانیی کوردسـتان هـەڵبژێردرا، لەشـوێنی ئەنجومـەنی یاسادانانی ناوچـەی کوردسـتان کەبەعسـی حاکم دایمەزراندبوو، لەهەمان ساختماندا دەوامـی کـردو بـەتێکڕای دەنـگ دوور لەدەسـەڵاتی حکومـەتی نـاوەند بڕیاریـاندا لـەچوارچێوەی عـیراقێکی دیموکراتیـی فیدرالیـی یـەکگرتوودا بمێننـەوەو پـرۆژەی ئۆتۆنۆمـی بگـۆڕدرێ بـەپرۆژەی فیدرالیـی دیموکراتـی، ئـەویش لەسـەر بنـەمای مـافی گـەلی کوردسـتان لەدەستنیشانکردنی چارەنووسی خۆی‌و لەسـەر بنـەمای

یەکگرتنی ئارەزوومەندانەش کە لەڕاستیدا ئەمە ئەو فیدرالییەیە کەدەخوازرێ.

قازانجەکانی ئەم فیدرالیەتە بۆ عیراق بەعەرەب و کوردو تورکمان و کلدۆئاشوورییەوە چین؟

١-فیدرالی دەبێتە مایەی پیادەکردنی ئارامیی و ئاسایش لەنێو کۆمەڵگای عیراقدا کەئەمەش گەشەکردنی پیشەسازی و کشتکاری و فەرهەنگی و نەشونما بەگشتی ئاسان دەکات.

٢-خەرجکردنی داهاتەکان لەگەشەکردنی ئابووری و نەشونماکردن و بووژاندنەوەی وڵات.

٣-پتەوکردنی برایەتی و خۆشەویستی لەنێوان نەتەوەکانی گەلی عیراق و پتەوکردنی گیانی هەستی نیشتمانی گشتی و شانازیکردن بەعیراقیبوون و بەهاووڵاتیبوونی عیراقی.

٤-دواتریش قایمکردنی یەکێتی نیشتمانیی لەسەر بنچینەیەکی پتەوو توندی مافی یەکسانی هاووڵاتیبوون، لەیەکسانیی راستەقینە لەکاروباری سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و هی دیکەدا.

٥-دابەشکردنێکی عادیلانەی سامانی نیشتمانی بەسەر هەموو ناوچەکانی عیراق و بەسەر هەموو نەتەوەو تایەفەو بەگوێرەی پێویستییەکانیان و بەگوێرەی رێژەی دانیشتووانیان و قەرەبووکردنەوەی

ئەو دواکەوتنەی کە لەئەنجامی جیاوازیی نەتەوەیی و تایفەگەریدا دروستبوو.

٦-دوورخستنەوەی عیراق لەمەترسی و زیانەکانی تەنازولکردن بۆ بێگانەو بۆ دراوسێکان لەپێناو سەرکوتکردنی ئەوانەی داوای مافە ڕەواکانیان دەکەن، کەخیانەتەکەی سەدام لەجەزائیر کەتەنازولی لەمافەکانی عیراق کرد لەشەتی عەرەب و خاکی عیراق لەپێناو وەرگرتنی پشتیوانیی شا دژی گەلی کورد، نیشانەی مەترسی ئەو تەنازولانەن کەبوونەمایەی جەنگێکی تاقەتپڕووکێنی بێهودە کەهەشت ساڵی خایاندو سەدان هەزار ڕۆڵەی عیراق و سەدان هەزار ملیۆن دۆلاری لەداهاتی عیراق بەفیڕۆدا.

٧-عیراق ناوبانگێکی دەولی باش پەیدادەکات، لەبەر ئەوەی بەولاتێکی شارستانی دادەنرێ کە هاوچەرخانە کاروبارەکانی هەڵدەسوڕێنێ و نموونەیەکە بۆ پێکەوەژیانی ڕۆڵەکانی بەویستێکی ئازادو جێبەجێکردنی دیموکراسیی سیاسی و عەدالەتی کۆمەلایەتی لەدابەشکردنی سامان و خێروبێرەکانیدا.

٨-وەرگرتنی سۆزو پشتیوانیی ملیۆنان کورد لەدەرەوەی عیراق بۆ دەوڵەتی عیراقی کەئەمەش یەکێتییە نیشتمانییەکەی و کیانە دەولییەکەی و بەرگرییە نیشتمانییەکەی پتەوتر دەکات.

٩-هاندانی وەبەرهێنانی بێگانەو کۆمپانیاو ولاتە دەوڵەمەندەکان بۆ بەشداریکردن لەنەشونماکردن و

پـــەرەپێدانی ئـــابووری لـــەعیراقێکی دیموکراتیـــــی ئاشتیخوازو ئارامو ئاسایش.

جگە لەوانەی باسـکران بـۆ هـەمووان سـاغ بـووەوەو سـەلمێندرا کـەناکرێ یـەکگرتنی بـەزۆریی پێوەلکێـن درێـژەی پـێ بدرێـت کـە بـۆ خـۆی پەناگـەو بوارێـك بـۆ دەستتێوەردانی دەرەکی دەرەخسێنێ بۆ ئەوەی ئاگری شـەڕی نـاوخۆ هەڵبگیرسـێننو ئـاژاوەو گـیروگرفت بـۆ عیراقی نوێ دروست بکەن.

لەبەر ئەوە خوازیـارانی یـەکگرتن (فیـدرالی) ئەوانـەن کە بـۆ بەرژەوەندییە بنچینەییـەکانی عـیراقو یەکێتییـە نیشـتمانییەکەیو قـازانجی گەلەکـەی بەپەرۆشـنو پێداویسـتییەکانی گەشـەکردنی ئـابووریو نەشـونماو پێشـکەوتن بـۆ عـیراق دابـین دەکـەن، بەپێچەوانـەی خوازیـارانی یـەکگرتنی بـەزۆر، کەزەمینەیـەك بـۆ نـاکۆکیو پارچەبوونی کۆمەڵایەتیو فیتنەو پشـێوییو تەنانەت شەڕی ناوخۆش سازدەکەن.

دەربارەی فیدرالی (یەکگرتن)و یەکێتیی نیشتمانیی عیراقی

-١-

# ئەو فیدرالییە (یەکگرتنە)ی ئێمە دەمانەوێ یەکگرتنێکی ئارەزوومەندانەی جوگرافییە نەك ئەتنیکی

فیدرالییەت دوای ئەوەی لەلایەن هێزە سەرەکییەکانی گەلی عیراق دانی پێدانرا رووبەڕووی شێواندن و شالاو بۆتەوە، فیدرالییەت وەك سیستمێك بۆ حوکمڕانیی ناوچەو هەرێمە جیاجیاکان یان ئەو نەتەوە جۆراوجۆرانەی کە لەنێو یەك ولاتدا دەژین دەعبایەکی ترسناك نییە مەگەر بۆ ئەو رژێمانەی کەنوقمی دیکتاتۆریەت و رەگەزپەرستی و شۆڤێنین، بەڵکو بۆتە راستییەکی زۆر بەسوودو چەمك و قەبووڵکردنێکی بەرەواج لەدنیای شارستانی و هاوچەرخدا.

بۆ ئیسلامییەکان دەڵێین: فیدرالییەت ماف و دەسەلاتەکانی کەمترن لەوەی کە موسوڵمانەکان لەمێژوودا لەهەرێمە ئیسلامییەکاندا بەڕێوەیان دەبرد، کەتاڕادەیەك دەسەلاتی هەرێمە ئیسلامییەکان

بەکۆنفیدرالی دەچوو، فیدرالییەت ئەگەر بەشێوەیەکی دروست بۆ سەر زمانی عەرەبی وەربگێڕدرێ مانای یەکگرتن دەگەیەنێت، بەلاّم یەکگرتنێکی ئارەزوومەندانەیەو لەسەر بنەمای رێزگرتن‌و داننان بەمافی هەرێمەکان یان ئەو نەتەوانەیە کەچێژی لێ وەردەگرن.

کاتێ هێزە سەرەکییەکانی ئۆپۆزسیۆنی عیراق‌و دواتریش ئەنجومەنی حوکمی ئینتیقالی فیدرالیەتیان بۆ هەموو عیراق هەڵبژارد، ئەوا عیراقێکی یەکگرتووی کۆڵەگە پتەوو یەکێتییەکی راستەقینەی عیراقییان ویستبوو کەهەموو ئەو نەتەوانەی لەسەر خاکی عیراقدا دەژین پێی رازین‌و بەرگریی لێ دەکەن، ئەو فیدرالییە (یەکگرتنەی) گەلی کوردستان دەیانەوێ‌و ئەنجومەنە نیشتمانییەکەی بەکۆی دەنگ بڕیاری لەسەرداوە چییە؟ ئایا فیدرالییەکی جوگرافی یان ئەتنیکی واتە نەژادییە؟

گەلی کوردستان یەکگرتنی (فیدرالی) بۆ گەلی کورد ناوێ لەعیراقدا، لەهەر کوێیەك کورد هەبێ بەڵکو یەکگرتنێکی (فیدرالی)ی بۆ هەرێمی کوردستانی عیراق دەخوازێ، کەئەوەش چەمکێکی جوگرافییە ئەو هەرێمە دەگرێتەوە کە لەمێژوودا بەکوردستان-ی عیراق ناسراوە.

کەواتە یەکگرتنێکی (فیدرالی)یە بۆ هەموو دانیشتووانی کوردستانی عیراق بەنەتەوەو مەزهەبە جیاجیاکانیەوە نەك نەژادی (ئەتنیکی)، ئێمە دەمانەوێ

حوکمڕانیی (فیدرالی-یەکگرتن) لەکوردستان حوکمڕانیی کوردو تورکمان بیّ بەو پێیەی ئەوان نەتەوەی دووەمن لەکوردستان‌و هی کلدۆئاشوور بێ کەنەتەوەی سێیەمن‌و هی ئەو عەرەبانەش بێت کە لەکۆنەوە تێیدا نیشتەجێن‌و چوارەمین نەتەوەن تێیدا، هەروەها دەمانەوێ هی سوننەو شیعەو ئێزدی‌و کاکەیی‌و شەبەکیش بێت، دەمانەوێت هی موسڵمان‌و مەسیحی بێت، جا بۆ ئەوەی مەسەلەکە بۆ خوێنەران ئاسانتر بکەین دەڵێین: چی دەبێ ئەگەر پارێزگاکانی بەسراو عیمارەو دیوانیەو ناسریە بڕیاربدەن بەگوێرەی چەمکی فیدرالی لەیەك هەرێمدا یەك بگرن؟ ئاخۆ دژایەتییان بکەین یان رێز لەویستی ئازادییان بگرین کە بەئازادییەکی تەواوەوە دەریانبڕیوە.

دەبا هەمان هزریش بۆ پارێزگاکانی سلێمانی‌و دهۆك‌و هەولێرو ئەوانی دی بکەین کە بەویستی خۆیان بڕیاریانداوە لەچوارچێوەی هەرێمی کوردستانی عیراقدا یەکبگرن؟ ئاخۆ بۆ دەبێت دوژمنایەتی بکرێ ئەگەر هۆکارەکە کینەی رەش نەبێ دەرهەق بەگەلی کوردو بوونی‌و مافەکانی؟ ئەوە لەکاتێکدا کێشەیەکی نەتەوەیی کوردی لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقی‌دا هەیەو تا ئەوکاتەی کۆمەڵەی نەتەوەکان بڕیاریدا کوردستانی نێو ولایەتی موسڵ بەعیراقەوە بلکێندرێ کەتایبەتمەندێتی کوردیی لەبەرچاو گرتبوو، بۆیە مافە فەرهەنگی‌و ئیدارییەکانی وەك مەرجێك بۆ دانابوو

بەتایبەتیش کەبەریتانیا پابەندی ببوو لەبەرئەوەی حکومەتی ئینتیداب بوو، هەروەها حکومەتی عیراقیش چونکە حکومەتی دامەزراوبوو پێش، ئەوەش هەردوو حکومەتی بەریتانی و عیراقی لەبەیانێکی هاوبەشیاندا لە ٢٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ دانیان بەحکومەتێکی کوردی ناوە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

حکومەتی خاوەن شکۆو حکومەتی عیراقی دان بەمافی ئەو کوردانەدا دەنێت کە لەچوارچێوەی سنووری عیراقدا نیشتەجێن کەحکومەتێکی کوردی لەچوارچێوەی ئەو سنوورەدا پێکبێنن و ئەوان هیواداریشن رەگەزە جیاجیاکانی کورد لەنێو خۆیاندا لەسەر شێوەی گونجاوی ئەو حکومەتەو سنوورەکەی رێك بکەون و کوردەکان نوێنەری بەرپرسی خۆیان بنێرن بۆ ئەوەی دەربارەی پەیوەندییە ئابوورییەکان لەگەڵ حکومەتی خاوەن شکۆو حکومەتی عیراقی گفتوگۆ بکەن.

بەلام بۆ ئەوەی خوێنەر لەحەقیقەتی سیاسی بەریتانیا بگات دەرهەق بەکوردستان ئەو هەڵسەنگاندنەی مامۆستا عەزیز شەریف-ی سەرۆکی حزبی گەل و سەرکردەی بەناوبانگی نیشتمانپەروەر وەردەگرین کەچۆن سیاسەتی بەریتانیای بەرامبەر بەکوردستانی باشوور (عیراق) هەڵسەنگاندووە کە بەم جۆرەیە:

سەبارەت بەکوردستانی باشوور، سیاسەتی بەریتانیا تا سالی ١٩٢٦ لەدلەڕاوکێدابوو و لەسەر هیچ بڕیارێك سەقامگیر نەبوو، لە ١٠ی ئایاری ١٩١٩دا حکومەتی بەریتانیا فەرمانی بەحاکمە گشتییە مەلەکیەکەی دا لەعیراق چەند ولاتۆکەیەکی ناوخۆ لەژێر حوکمڕانیی شێخەکانی کورد پێکبێنێ بەو مەرجەی ئەوان لەژێر رێنمایی ئەفسەرە بەریتانیاییەکاندابن و هۆشیاریشی کردۆتەوە کەنابێ هیچ هەنگاوێك بنێن نیشانەی ئەوەبێ کەسیاسەتی بەریتانیا دەستنیشانکراوە، هەروەها هەڵسا بەپێکهێنانی حکومەتێك لەسلێمانی بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود، هەروەها کاتێك پەیماننامەی سێڤری ١٩٢٠ داندرا باس لەپرۆژەی دەوڵەتێکی کوردی کرا، بەلام پاشان بەریتانیا لەژێر گوشاری تورکیا لێی پەشیمان بووەوە.

سالی ١٩٢٢یش بەریتانیا لەگەڵ حکومەتە عیراقییەکەی دەستکردی خۆی کە لەژێر سایەی ئینتیدابی بەریتانیادا بوو پشتگیری خۆی بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی کوردی راگەیاند، بەلام هۆکاری ئەم دڵەڕاوکێیە لەسیاسەتی بەریتانیا جگە لەو مساوەمانەی کە بەدەستبەرداربوونی فەرەنسا لەسەر ئەو ناوچەیە بەڕێککەوتننامەی سانریمۆی ١٩٢٠ کۆتایی پێهات وەك پێشتر باسکراوە دەکرێ دوو هۆکاری سەرەکی هەبن کە ئەمانەن:

*سیاسەتمەدارانی ئیمپراتۆری متمانەیان بەکوردێکی خاوەن دەسەڵات نەکرد تا پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیانی پێ بسپێرن.
*دواکەوتنی ساغکردنەوەی هەڵوێست لەحکومەتی تازەی تورکیدا (کەمالی)و دەستنیشانکردنی ئاراستەی سیاسەتەکەی.
ئەوەی پەیوەندیی بەهۆکاری یەکەمەوە هەیە ئەوەیە کەئیستعماری بەریتانی روویکردە شێخ مەحمود کە بەدەسەڵاتترین شێخی کورد بووو کردی بەحاکمی سلێمانیو رایگەیاند کە لاریی نییە ئەگەر دەوڵەتەکەی هەموو هۆزە کوردییەکانی نێوان زێی گەورەو رووباری دیالە بەخۆوە بگرێ، بەلام خەونەکانی شێخو رەفتارەکانی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئیمپراتۆریەت یەکدیگرنەبوون، یەکێك لەباوەڕپێکراوەکانیان سەبارەت بەشێخ دەڵێ: "ئەو گرفتی سەرەکیمانە، نەزانە، بەلام ساکارێکی رەمەکی نییەو زۆر درە ئەگەر ئۆردویەك نەبێ، هەروەها رابردووی ئەو لەسەردەمی تورکیدا ئەوە ناگەیەنێ جێی متمانەبێ، چونکە لەشۆڕشی بەردەوام بووە دژی حوکمی تورکی"، ئەم گاشەبەردە سەختە لەکوێو مەرمەڕەکەی فەیسەڵ لەکوێ کەوەستاو پەیکەرتاشەکانی ئیمپراتۆریەتی خۆشحاڵ کرد!
سەبارەت بەهۆکاری دووەمیش واتە هەڵوێستی حکومەتی تورك و ئەو مساوەمانەو ئەو وەحشیگەرییەی

بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد لەساڵی ١٩٢٥ گرتیەبەر ئاراستە فاشییەکەی دیاریکرد.

لەهەمان ساڵیشدا بەریتانیا بڕیارێکی لەکۆمەڵەی نەتەوەکان وەرگرت بەلکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعیراقەوە کە کوردستانی باشوور-یشی دەگرتەوە، ساڵی ١٩٢٦یش جۆرێك رێکەوتن هاتەپێش کە لەپەیماننامەی ئەنقەرەی سێ قۆڵیدا لەنێوان بەریتانیاو عیراق و تورکیادا مۆرکرابوو بەتاڵکرایەوە (عەزیز شەریف: کێشەی کورد لەعیراق) هەروەها مامۆستا عەزیز شەریف هۆکارەکانی لکاندنی کوردستانی باشوور بەعیراق و راستەوخۆ هەڵنەسوڕاندنی لەلایەن داگیرکەرەوە شی دەکاتەوەو دەڵێ:

"سیاسەتی بەریتانیا دەرهەق بەکوردستانی باشوور لەسەر ئەم شێوەیە سەقامگیربوو کە بەعیراقەوە بلکێندرێ و بواری هیچ جۆرە ئۆتۆنۆمییەکی کوردی نەدرێ، ئەم پێوەلکاندنەش لەبەیانەکان و گۆڤارە رەسمییەکانداو لەکتێبی نووسەرە سەرمایەدارەکاندا وا لێکدراوەتەوە کە لەپێویستییە جوگرافی و بازرگانییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، گومانی تێدا نییە کە لەنێوان کوردستانی باشوورو ناوەڕاستی عیراقدا پەیوەندیی ئابووری و کۆمەڵایەتییەکی زۆر هەبووە، بەڵام ئەو پەیوەندییانە پێویستی بەپێوەلکاندنێکی ئیستعمارگەرانە نییە.

بـــــەڵام مەبەســــــتەکانی ئــــــەو پێوەلکاندنــــــە ئیستعمارگەرییەکی ئابڕووبەرو ستراتیژیو ئیستغلالیە، تەنانــەت نوێنـــەرەکانی ئیمپراتۆریـــەتی بـــەریتانیاش نـەیانتوانی ئـەو حەقیقەتـە بشارنەوە کـە لـەو وتـارەدا هـاتبوو باوەڕپێکراوی سامی بـەریتانی لـە ١١ی ئـابی ١٩٣٠ لەسلێمانی خوێندیـەوە دەڵـێ: دەبینـم هێنـدێ سەرچاوەی نابەرپرس پێیان وایە سیاسەتی حکومـەتی خـاوەن شـکۆی بـەریتانی گـەلی کـورد هـاندەدا کەئەمـە ڕاست نییە، هـەر لەبەرئـەوەش نـا کەحکومـەتی عـیراقی دەشـڵەژێنێ بـەڵکو لەبـەر ئـەوەش هـەردوو دراوسـێیە خۆشەویسـتەکە دەشـڵەژێنێ کەحکومـــەتی تورکیـــاو حکومەتی ئێرانن کەهیچ شتێك لەم گومانـە دوورتـر نییـە لەڕاستی" هـەروەها مامۆسـتا عـەزیز شـەریف هۆکـاری هەڵنەسـوڕاندنی ڕاســتەوخۆی داگیرکـــەری بـــەریتانی ڕووندەکاتەوەو دەڵێ:

"مەبەســـــت لەهەڵنەســـــوڕاندنی ڕاســــــتەوخۆی داگیرکەری بەریتانیا بۆ کوردستانی باشوور ئەوەیە خۆ لـــەو خەرجییـــە زۆرە بـــەدووربگیرێ کــــەداگیرکردن دەیخوازێ، داگیرکەری بەریتانی پۆلیسی خۆی هەیە بۆ ئـــەوەی بەخزمـــەتگوزاریی پاســـەوانیکردن لـــەعیراق هەڵبســتێ بەکوردستانیشــەوە، تــا مەســرەفی خــۆیو مەسرەفی تێکشکاندنی بزووتنەوەی نەتەوایـەتی کـورد لەجـەماوەری زەحمەتکێشـی عـیراق وەربگـرێ، لـەجیاتی

ئـــەوەی بکەوێتــە سەرشـــانی خەزێنـــەی بـــەریتانی، (سەرچاوەی پێشوو).

دوابـەدوای لکـاندنی کوردســتانی باشـوور بـەعیراق خوالێخۆشبوو مـەلیك فەیسـەڵی یەکـەم و گـەلێ لەسـەرەك وەزیرەکـانی جـەختیان لەسـەر ڕێزگرتنـی ناسـنامەی کـوردی و مافـە ئیـداری و فەرهەنگییـەکانی کـردەوە، هەروەها دان بەزمانی کوردی نرا وەك زمانێکی ڕەسمـی لەکوردسـتان و بەڕێوەبەرایـەتی پـەروەردەی کوردسـتان دامـەزرێندرا کەمەڵبەندەکـەی لەکـەرکوك بـوو، پاشــان یاســای زمانـــە ناوخۆکـــان دەرچـــوو، ئەمانـــە وەك جێبـــەجێکردنی بەڵێنـــەکانی بـــەریتانیاو حکومـــەتی عیراقی بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان دەرهەق بەمافە ڕەواکانی گـەلی کورد، ئـەو مافانـەی کـە لەلایـەن بـەریتانیاو عـیراق وەك مـەرجێکی سـەرەکی داندرابوون بۆ بڕیـاری کۆمەڵـە سـەبارەت بـەلکاندنی ویلایـەتی موسـڵ بەکوردسـتانی عیراقیشـەوە بەدەوڵـەتی عـیراقی، هــەروەها وەك مـەرجێك بۆ وەرگرتنی عیراق لەکۆمەڵەی نەتەوەکاندا.

پێویســتیمان بەدووپاتکردنـــەوەی ئـــەو ڕاســتییانە هەیـــە چونکـــە زۆر لـــەبرا عەرەبـــەکان لـــەناو عـــیراق و دەرەوەیدا مێژووی عیراق نازانن و ئاگاداری ئەوەنین ئـەم دەوڵەتـەی عـیراق چۆن دامـەزراوەو کوردسـتانی باشـوور چۆن پێیـەوە لکێنـدراوە، هێندێـك لەوانە کەقسـە لەسـەر گـەلی کـورد دەکـەن خۆیـان لـەوە گێـل دەکـەن کـەبوونی هەیـەو وەك چـۆن گـەلانی دی مافیـان هەیـە ئـەویش

هەیەتی، بەمافی چارەی خۆنووسینیشەوە، هەروەها خۆیان لەمێژووی خەباتی گەلی کوردو مێژووی گەشەکردنی پەیوەندییەکانی گەلی کورد لەگەڵ حکومەتی عیراقی گێل دەکەن، تەنانەت هێندێکیان خەیاڵی ئەوە دەکەن کوردستان وەك پارێزگای بەسرایەو بۆ نموونە ناوچەیەکە پابەندی هەمان ئیعتبارات و پێوانەیە بێ ئەوەی ئاگایان لەو راستییە بێ کەباسمانکردن.

کەواتە فیدرالی (یەکگرتن)ی هەرێمی کوردستان چارەسەرێکی سەرکەوتووە بۆ کێشەی دێرینی نەتەوەیی لەعیراقدا، وەك چۆن پیادەکردنی ئەو دیموکراسییەشە کە لەگەڵ مەرکەزیەتی توند پێچەوانەیە، جا وەك پرەنسیپێك بۆ بیروباوەڕی فیدرالی کەهەموو حزبە تێکۆشەرەکانی عیراق بەکوردستانی عیراقیشەوە سەلماندوویانە، دیموکراسی واتا حوکمی گەل لەرێگەی نوێنەرەکانییەوەو چارەسەرکردنی کێشەکان بەپێی پێوانە دیموکراسییەکان کەگرنگترینیان مافی چارەی خۆنووسین و یەکگرتنی ئارەزوومەندانەیە، هێندێ راستی دیکەش هەن دەبێ ئاماژەیان پێ بدرێ ئەویش واتا و چەمکی فیدرالییە، فیدرالی واتا یەکگرتنەوە نەك دابەشکردن و پارچە پارچەکردن، فیدرالیەت لەمێژوودا بۆ ئەوە هاتووە هەرێمەکانی سەر بەیەك نەتەوە یەکبخات وەك ئەڵمانیای فیدرالی یان چەندین نەتەوە یەکبخات لەیەك

دەوڵــەتدا وەك كەنــەداو ویلایەتــە یــەكگرتووەكانی ئەمریكا.

هــەروەها یــەكگرتنی نیشــتمانیی هــەر دەوڵــەتێك راســتو عادیلانــە دەرنــاچیٚو نــاژی ئەگــەر لەســەر بنچینــەی یــەكگرتنی ئارەزوومەندانــەی ئــازادی ئــەو نەتەوانــە دانەمــەزرابێ كەپێكــەوە لــەنێو یــەك ولاتــدا دەژین، گەلی كوردســتانیش بەویســتی ئازادانــەی خــۆی (تەنانــەت بەنــەبوونی دەوڵــەتی مەركــەزیش) لەڕێگــەی نوێنــەرە هەڵبژێردراوەكانیــەوە لەئەنجومــەنی نیشــتمانیی كوردســـتان یــەكگرتنی ئارەزوومەندانــەی لەگــەڵ گــەلی عــەرەبی بــرای لەســـەر بنچینــەی فیــدرالی (یــەكگرتن)ی خۆبەخش هەڵبژارد.

مێــژووش ســەلماندوویەتی كــە بــەزۆر یــەكگرتنی لەســـەر بنچینــەی پێوەلكــاندنی بــەناڕەزایی خــۆی لەبــەردەم ڕەشــەباو كارەســاتەكان نــاگرێ -ئەوانــەش ئێستا چەند زۆرن- بەڵكو لەیەكەم دەرفــەتی گونجاودا هەرەس دێنێ و زۆرلێكراوەكان لێی رادەپەڕن.

لەكۆتاییدا ئەحمەد بن بللەی موجاهید كەیەكێك بوو لەســەركردە مێژووییــەكانی شۆڕشــی جــەزائیر جەرگــەی راستیی پێكاوە كەدەڵێ:

كێشــەی گــەلی كــورد كــە لــەپێناو ئــازادبوونو پێشكەوتنو مافی چارەنووسیان خەبات دەكــەن هــەقی ئەوەی هەیە لەلایەن هێزە عەرەبییەكانو ئیسلامییەكان هــەموو ســۆزو پشــتیوانییەك وەربگــرن بــۆ ئــەوەی ئــەم

خەباتــە وەك بەشـێك لەخــەباتی گــەلانی ئیســلامی دژی ئیمپریالیــەتو دەستبەســەرداگرتنی بێگانــە بمێنــێو لــەپێناو ئـازادبوون‌و رزگـاربوون لەکۆیلایـەتی رۆژئـاواو بنیاتنانی دنیایەکی نوێ، یـەکێتی پتـەوی گـەلان نـاکرێ دروست ببێ ئەگـەر لەسـەر بنـەمای ئازادیی هـەڵبژاردن‌و رێگــــەدان بـــــەفرەحزبی‌و فەرهەنگییـــــەکی فـــــراوان دانەمــەزرێ، ئـەو فرەییــەی کەمایــەی دەوڵەمــەندبوون‌و بەهێزییـە بـۆ وڵاتەکـەمان، کــەچی چارەســەری بــەزۆرو بـــەزەبرو زەنـــگ دەبێتـــە مایـــەی قووڵکردنـــەوەی ناکۆکییــەکان‌و بــەفیڕۆدانی وزەو توانــای گەلەکـــەمان (ســەرۆك بــن بلــە لەبانگــەوازێکی تایبــەتدا لەســاڵانی هەشتاکان سەبارەت بەگەلی کورد).

بـــەڵام ئۆپۆزســـیۆنی عـــیراقی لـــەکۆنگرەکانیدا نوێنەرایەتی لایەنە سەرەکییەکانی دەکرد، هـەروەها ئـەو حزبە سەرەکییانەش کە لـەکۆنگرەکانیدا بەشدارنەبوون، هەرهـەموویان جـەختیان لەسـەر ئـەوە کردۆتـەوە کـەدەبێ چارەســەری کێشــەی کــورد بــەفیدرالی‌و دیموکراســی بکرێ.

کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی ڤییەننا جەختی لەسەر مافی چـــارەی خۆنووســـین بـــۆ گـــەلی کـــورد کردۆتـــەوە لەچوارچێوەی یەکێتی عیراقیدا، ئەمە ئەو بڕگەیەیە کە لـەنێو پرۆتۆکـۆلی هاریکـاریی نێـوان ئەنجومـەنی بـاڵای شۆڕشـــی ئیســـلامی بەســـەرۆکایەتی شـــەهیدی نـــەمر ئایـەتوڵڵا سـەید محەمـەد باقر ئەلحـەکیم (قـودس سـره)و

یەکێتی نیشتمانیی کوردستان هاتووە، هەروەها کۆنگرەکانی صلاح الدینو نیویۆرکو دیدارەکانی سەرکردایەتی باڵای ئۆپۆزسیۆن لەواشنتۆن لە ئابی ۲۰۰۲دا، هەروەها کۆنگرەی لەندەنو دواتریش کۆنگرەی صلاح الدین هەر هەموو ئەو کۆنگرانە بەکۆی دەنگ جەختیان لەسەر چارەسەری فیدرالیو ڕێزگرتن لەویستی گەلی کوردستان کردۆتەوە کەئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان دەریبڕی، هەروەها هەموو کۆنگرەکان جەختیان لەسەر ئەوەش کردۆتەوە کە ئەم چارەسەرە یەکێتی نیشتمانیی عیراقی پتەوتر دەکاتو برایەتی عەرەبو کورد پتەوتر دەکات، کۆنگرەی لەندەنو صلاح الدین پێ لەسەر وەدیهێنانی خواستە ڕەواکانی گەلی کوردو پاککردنەوەی هەموو شوێنەوارەکانی چەوساندنەوەو بەکارنەهێنانی زەبروزەنگ دادەگرێ لەسەر بنچینەی چەمکی یاسایی نێودەوڵەتی کە مافی ئەوەی پێدەدات بەخۆی چارەنووسی خۆی هەڵبژێرێو جەخت لەسەر گیانی برایەتیو یەکگرتنو هاوبەشی بکات لەیەك وڵاتدا.

دەربارەی فیدرالی (یەکگرتن)و یەکێتیی نیشتمانیی عیراقی

-٢-

# دژایەتیکردنی فیدرالی (یەکگرتن)، دژایەتیکردنی یەکێتیی نیشتمانیی عیراق دەگەیەنێ

کوردانی ئازادیخواز بەوە تاسان کەهێندێ لەبرایانی شیعە دژی فیدرالی خۆپیشاندانیان کرد، ئەگەرچی ژمارەیان کەم بووو ئەگەرچی لای هەموانیش ئاشکرایە کە سەرکردەکانی ئەو برایانە لایەنێکی گرنگی شیعە پێك ناهێنن بەڵکو لەجەماوەری شیعەی عەرەبیش دابڕاون، لەگەڵ ئەوەشدا کورد کە هەر لەسەرەتای دامەزرانی دەوڵەتی عیراقەوە بەهاوپەیمانێتی راهاتوون لەگەڵ شیعە، سەرسووڕماو بوون بەرامبەر ئەو هەڵوێستەی کەدژی مافێکی ئاسایی گەلی کوردستانە، مافێك کە (١٢) ساڵە گەلی کوردستان

پەیرەوی دەکاتو لەو ماوەیەشدا هەموو ئازادیخوازانی عیراق نەك هەر دانیان پێدانـاوە بەڵکو موبارەکەیشان کردووە، لەپێش هەمووشیانەوە ئازادیخوازە عەرەبە شیعەکان.

گەلی کورد کە بەشکۆداریی و ڕێزەوە هەڵوێستە جوامێرانەکەی شەهید ئایەتوڵڵای عوزما سەماحەتی سەید محەمەد باقر حەکیمی لەبیرە کە داکۆکی لەگەلی کوردو خودی فیدرالی کرد، سەرسامو سەرسوڕماو دەبن کەگوێبیست دەبن گوتاربێژێکی شیعە کەدەبوو درێژەپێدەری پەیامەکەی شەهیدی نەمر بێت، لەگوتاری هەینیدا دژی مافی گەلی کوردستانی عیراق لەفیدرالی قسەدەکات، ئەو مافەی کە گەل لەکوردستانی عیراقدا بۆ خێروخۆشی عیراقو گەلەکەی بەعەرەبو کوردو تورکمانو ئاشووریو کلدانەوەو بەدانپێدانانی هەموو لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی بەئۆپۆزسیۆنی ئیسلامیی شیعەو حزبی دەعوەو ڕێکخراوی عەمەلی ئیسلامی عیراقیشەوە، پەیرەوی دەکات.

کوردستانی فیدرال هەمیشە پەناگەو جێی حەوانەوەی ئازادیخوازانی عیراق بووە بەتایبەتیش برا عەرەبە شیعەکانمان، گەلەکەشی نموونەیەکی زێدە جوانی پابەندبوون بوو بەیەکگرتوویی نیشتمانیو پاراستنی یەکێتی عیراق، بەتایبەتیش دوای ئەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان بەکۆی دەنگ بڕیاریدا لەچوارچێوەی عیراقدا بمێنێتەوەو

پەیوەندییەکانی گەلی کوردستان لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی لەسەر بنچینەی فیدرالی ڕێك بخات.

ئەو فیدرالییەی ئێمە هەر هەموومان لەئۆپۆزسیۆنی عیراقیدا خوازیاری بووین و دواتریش لەئەنجومەنی حوکمدا تەنیا وابەستە نییە بەکوردستانی عیراقەوە، بەڵکو فیدرالیەتێکە بۆ هەموو عیراق، باشوورو باکووری، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای، هەروەها فیدرالییەتێك نییە بەتەنیا بۆ پارێزگاکان بێت، بەڵکو ئەو مافە بەهێندێ لەپارێزگاکانی دەوروبەریش دەدات بەزۆرینەی دەنگی پێویست لەنێوان خۆیاندا یەکبگرن بۆ ئەوەی هەرێمێکی لەپارێزگا فراوانتر پێك بێنن، ئەمە چ خەوش و هەڵەو زیانێکی تێدایە، مەگەر ئەوە پەیڕەوکردنی ڕاستەقینەی دیموکراسی و مافی خەڵك نییە لەعیراق بۆ دەستنیشانکردنی ئیدارەی خۆیان و چێژوەرگرتن لەمافەکانیان؟! ئەوەی ئێستا لەکوردستانیشدا هەیە جگە لەپەیڕەوکردنێکی دەستپێشخەرانە هیچی دی نییە بۆ ئەم مافەی کە بۆ هەموو عیراقییەك دەگەڕێتەوە، ئەویش بەهۆی ئازادبوونی سێ پارێزگای کوردستان دوای ڕاپەڕین و پەیڕەوکردنی ئەم مافە ئاساییەی.

بەم جۆرە دەبینین ئەوانەی دژایەتی فیدرالی دەکەن، دژایەتی مافی گەلی عیراق دەکەن لەپەیڕەوکردنی مافەکانی و چێژوەرگرتن لەمافە دیموکراتییەکانی.

ئەوانـەی دژایـەتی فیـدرالی دەکـەن لەسـەریانە لـەم راستییەی خوارەوە وردببنەوە:

یـەکگرتنی نێـوان گـەلان دوو جـۆرن: یـەکگرتنێکی پێوەلکێنـی بـەزۆرو نـاڕەزایی و بـەئاگرو ئاسـن کـە لەڕاسـتیدا یـەکگرتنی کـۆت و پێوەندەکانـەو هیـچ پەیوەندییەکی بـەو یەکگرتنـە راسـتەقینەیە نییـە کـە لەسـەر بنچینـەی یـەکگرتنی ئارەزوومەندانـەو لەسـەر ویستی ئازادی ئەو گەلانە پێکدێـت کـە لەسـایەی یـەك دەوڵـەتدا پێکـەوە دەژیـن، مێژووش ئەوەی سـەلماندووە کەیەکگرتنی بەزۆر، یەکگرتنێکی پووچەڵ بووەو لەگەڵ ولاتدا نەماوەو جگە لـەناکۆکیی خوێنـاویی و شـۆڕش و شەڕی نـاوخۆ کەهێندێ جاران بۆتە شـەڕی ناوچـەیی و تەنانـەت دەولیـش وەك ئـەوەی لەبـەلکان و خۆرهـەلاتی ناوەڕاست روویدا نەبۆتە مایەی هیچی دی.

یـەکگرتنی راستەقینەش لەسەر بنچینەی یـەکگرتنی ئارەزوومەندانـە، توانـای ژیـان و گەشـەکردن و مانـەوەی هەیـەو دەبێتـە مایـەی ئاشـتی و برایـەتی و هاریکـاری بەرهەمهێن لـەنێوان گـەلاندا، ئێسـتاکەش لـەعێراقدا گـەلی کـورد خوازیـاری یـەکگرتنێکی راسـتەقینەیە لەسـەر بنەمای یەکگرتنی ئارەزوومەندانە لـەنێوان هـەردوو گـەلی بـرای عـەرەب و کـوردو نەتـەوەکانی تورکمـان و کلدۆئاشووری.

هەروەها لەسەر ئەوانە پێویستە کەدژایـەتیی فیـدرالی دەکـەن لـەو راسـتییانە بگـەن و بزانـن کـە دژایـەتیکردنی

فیدرالی (یەکگرتنی ئارەزوومەندانە) دژایەتیکردنی یەکگرتنی راستەقینەی عیراق دەگەیەنیّ، لەوەش زیاتر پێویستە لەسەریان لەو واقیعە وردببنەوە کە لەئارادایەو بزانن فیدرالی کوردستان کەزیاتر لەدوازدە ساڵە هەیە، ئایا دەیانەویّ لەناوی ببەن؟ ئایا دەیانەویّ مافی گەلەکەی لەو فیدرالییە زەوت بکەن کەئێستا هەیەتی؟ ئاخۆ دەزانن یان نازانن کە لەناوبردن‌و زەوتکردنی ئەو مافە وەدەست هێنراوەی گەلەکەی نایەتەدی مەگەر بەشەڕێکی ناوخۆی هارەرو لەسەر لاشەی دەیان هەزار ئەگەر نەڵێین سەدان هەزار عیراقی نەبیّ بەعەرەب‌و کوردەوە؟ ئاخۆ دوژمنانی فیدرالی بیریان لەو راستییە کردۆتەوە کە ئەوان بەو بانگەوازەیان بۆ لەناوبردنی ئەو فیدرالییەی ئێستا لەکوردستاندا پەیرەودەکریّ لەشۆڤێنیەتی سەدام حسێن‌و دوژمنایەتیکردنەکەی بۆ گەلی کورد تێدەپەڕێنن، بەتایبەتیش کە ئەو لەژێر گوشاری خەباتی کوردو پشتیوانیی گەلی عیراق ناچارکرا دان بەئۆتۆنۆمی بۆ کوردستاندا بنیّ‌و دواتر ناوچەی کوردستانی ئۆتۆنۆم پێکبێنیّ، کەهەمان ئەو ناوچەو هەرێمەیە کەئێستا گەلی کورد فیدرالیەتی تێدا پەیرەودەکات، کاتی خۆی سیّ یاساش دەرچوو بەناوی "یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان‌و یاسای ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی کوردستان‌و یاسای ئەنجومەنی راپەڕاندنی ناوچەی کوردستان" ئاخۆ

دوژمنـــانی فیـــدرالی بەپێویســـتی دەزانـــن ئـــەو دەســـتکەوتانەی گـــەلی کوردســـتان زەوت بکـــەن کـــە بـــەخوێنی ســـەدان هـــەزار شـــەهید تەنانـــەت لـــەڕژێمی دیکتاتۆریی گۆڕبەگۆڕیشەوە وەدەستیان هێناوە.

مەگـەر شـەرەفمەند دەبـن ئەگـەر لەجـەللاد، جـەللادی عـــەرەب و شـــیعەو کـــوردو ســـوننەو تورکمـــانیش شـۆڤێنیتربن؟ بـەم جـۆرە دژایـەتیکردنی فیـدرالی جگـە لەدژایـەتیکردنی یـەکگرتنی نیشـتمانیی راسـتەقینەی عـیراق و زەوتکردنـی دەسـتکەوتەکانی گـەلی کوردسـتان هیچی دیکە ناگەیەنێ.

"اللهم اهد قومي انهم لايفهمون ولايفقهون"

-٣-

## دژایەتیکردنی فیدرالی فیتنەو شەڕی ناوخۆ دەنێتەوە
## واتای فیدرالیی ( یەکگرتن )و رۆڵەکەی
## حەقیقەتی واتای فیدرالیی ( یەکگرتن )و رۆڵەکەی:

فیدرالی بانگەشەیەکی گشتیی عیراقییە وەك باشترین سیستەم بۆ بەڕێوەبردنی عیراق و دابەشکردنی دەسەلاتەکانی ناوەندو بەدیهێنانی نامەرکەزیی راستەقینە لەئیدارەو کاروباری فەرهەنگی و ناوخۆیی و تایبەتەکاندا. دە ساڵ زیاترە فیدرالی حەقیقەتێکە واقیعەو هەیە لەکوردستانی عیراقدا، هەروەها فیدرالی سیستەمێکە لەدەیان وڵاتی ئاسیایی و ئەوروپایی و ئەمریکی کاری پێدەکرێ، بۆ نموونە: دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبی دەوڵەتێکی فیدرالییە، هەروەها هیندو پاکستان و ئوسترالیاو ئەڵمانیاو سویسراو شانشینی یەکگرتوو (بەریتانیا)و بەلجیکاو ئیسپانیاو کەنەداو وڵاتە یەکگرتووەکان و دەیان وڵاتی دی.

فیدرالی لەمێژوودا بۆ یەکخستنی ولاتان هاتووە، ئەویش بەیەکەوە گرێدانی هەرێمەکانی بەیەکترەوە وەك چۆن لەئەڵمانیاو کەنەداو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا روویدا.

هەروەها فیدرالی مومارەسەکردنی دیموکراسیە لەحوکمڕانی و ئیدارەیەکی هاوچەرخدا، فیدرالی مومارەسەکردنی مافی گەلانە لەچارەی خۆنووسیندا.

بۆ نموونە گەلی کورد یەکێکە لەگەلانی ئیسلامی نەك بەشێك بیّ لەنەتەوەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی، بەڵکو گەلێکە خوا خولقاندوویەتی هەزاران ساڵە لەسەر خاکی نیشتمانی خۆی دەژی کە کوردستانەو فەرهەنگو دابونەریتی تایبەتی خۆی هەیەو زمانی تایبەتی خۆی هەیە، وێڕای ئەوەی کەموسڵمانە زۆربەشی لەسەر مەزهەبی (شافیعی)ن کەجیاوازیی هەیە لەگەڵ مەزهەبەکانی شیعە لەئێرانو حەنەفیەکانی تورکیاو سوریاو عیراق.

هەروەها گەلێکی هاوپەیمانە لەگەڵ نەتەوەی عەرەبو تورکو فارسو گەلانی دی، گەلی ئێمە رۆژێك لەرۆژان خاکی کەسی نەبەزاندووەو شتێکی لەمافی دراوسێکانی زەوت نەکردوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە خۆی دووچاری زوڵمو خاكو ماف زەوتکردن بووە.

ئەمە حەقیقەتێکی مێژووییەو ئیدی کەس ناتوانیّ نکوڵی لێبکات، ئەم گەلی کوردەی کە بەشێکە لەنەتەوەی ئیسلامو بەشێك نییە لەنەتەوەی عەرەبو

فـارس‌و تـورك مـافی چـارەی خۆنووسـینی خـۆی لەشێوەی یەكگرتنی ئارەزوومەندانەی ئازاد لەگەڵ گەلی عـەرەبی برایـدا لـەعیراق پیـادەكردووە، كەدەسـتووری عـیراقیش لەرێككەوتنەكـەی ئـاداری ١٩٧٠ دانـی پێـدا ناوەو دەقەكەی بەم جۆرەیە:

"گـەلی عیراق لـەدوو نەتـەوەی سـەرەكی پێك دێت كـە نەتەوەی عەرەب‌و نەتـەوەی كوردن‌و ئـەم دەسـتوورە دان بەمافە نەتەوەییەكانی گەلی كورددا دەنـێ"[٧] كەواتە گـەلی كـورد حەقیقـەتێكی دەستووریشـە، مـافی تەواویشـی هەیـە لـەدیاریكردنی چارەنووسـی خـۆی، ئەمەشـی بەیـەكگرتنی ئارەزوومەندانـەی ئـازاد كـرد لەگـەڵ گـەلی عـەرەبی بـرای لـەعیراقدا، دواتـر مـافی ئەوەیشـی هەیـە كەجۆری پەیوەندییەكانی لەگـەڵ حكومـەتی مەركـەزیدا دەستنیشـان بكـات، ئـەویش بـەرەچاوكردنی ئـەو حەقیقەتـەی كەدەوڵـەتی نـاوەند تـەواوی مافـەكانی سـەروەریی هەیـە كەسـەرۆكایەتی دەوڵـەت، هـێزی سـوپایی‌و پەیوەندییـەكانی دەرەوە (دیپلۆماسـی)، دراوی نیشـتمانیی، دارایـی گشـتی، سیاسـەتی بازرگانیی دەرەوەو هێندێ كاری دیكەش دەگرێتەوە.

گـەلی كـورد بـەبڕیاری ئەنجومـەنی نیشـتمانیی كوردسـتان‌و بـەتێكڕای دەنـگ ئـەم یەكگرتنـە ئارەزوومەندانـە واتـە ئـەم فیدرالییـە (یەكگرتنـە)ی هەڵبژارد.

فیدرالی، وشەیەکی لاتینییەو بەعەرەبی دەکاتە (الاتحادیة)-یەکگرتن- بۆ نموونە ئەڵمانیای فیدرالی، (المانیا الاتحادیة)ی پێدەگوترێ.

کەواتە دژایەتیکردنی فیدرالی، دژایەتیکردنی یەکگرتنە، واتە دژایەتیکردنی یەکگرتنی ئارەزوومەندانەی ئازادە لەنێوان هەردوو گەلی برا عەرەبو کورد، ئەمەش دژایەتیکردنی ئەو واقیعە دەگەیەنێ کە لەکوردستانی عیراقدا هەیەو هەوڵێکە بۆ زەوتکردنی ئەو مافو دەستکەوتانەی ئێستاکە گەلی کوردستان بەکاریان دێنێ.

کەوابێ مافی ئەوەمان هەیە بپرسین چۆنی دژایەتی ئەو واقیعە دەکەن کەهەیە؟ ئاخۆ شەڕێکی سەددامیانەی دیکە لەدژی گەلی کوردستان بەرپادەکەن؟ ئایا بانگەشە بۆ (جیهادی پیرۆز) دەکەن بۆ ئەوەی دەستکەوتو مافە بەدیهاتووەکانی گەلی کوردستان زەوت بکەن، یانیش خوازیارانی دژایەتیکردنی فیدرالی یەك شتی راستەقینە نە دەربارەی فیدرالیی (یەکگرتن)و نە دەربارەی ئەو واقیعو حەقیقەتانە نازانن کە لەسەر زەمینەی واقیعی کوردستانی عیراقدا هەیە؟

لەو باوەڕەداین نەزانینی حەقیقەتی فیدرالی هۆکارێکەو خۆگێلکردنیش لەو واقیعو حەقیقەتانەی لەکوردستانی عیراقدا هەن هۆکارێکی دیکەیە، بەلام هۆکاری گرنگتر ئەو نەزعە شۆڤێنییە رەگەزپەرستانەیە کەحەقیقەتی بوونی گەلی کورد رەتدەکاتەوە

کەتایبەتمەندێتی و بارودۆخی تایبەتی خۆی هەیە، ڕەنگە بگوترێ ئیسلام جیاوازی لەنێوان نەتەوەکان ناکات، بەڵام بەبۆچوونی ئێمە تەفسیری دیکەی هەڵەش هەیە کەجیاوازی لەنێوان عەرەب و عەجەم دەکات (واتە غەیرە عەرەب) بەپێچەوانەی ئەو ئایەتە پیرۆزەی کە دەڵێ: (**یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شعوباً وقبائل لتعارفوا ان اکرمکم عند الله اتقاکم**).

پاشان ئەو حوکمڕانییە ڕاست و دروستە ئیسلامییە کوانێ؟ تائێستا یەك حوکمڕانیی ئیسلامیمان نەدیوە هەر لەسەردەمی سەفەویەکان و دەوڵەتی عوسمانییەوە بگرە تا ڕۆژی ئەمڕۆ جیاوازیی لەنێوان کوردو نەتەوەی باڵادەستدا نەکردبێ.

کاتێ نەتەوەی ئیسلام بڕیاری پێکهێنانی تاکە دەوڵەتی خۆیدا، گەلی کوردی موسڵمان دژی ئەو کۆدەنگییە نەبوو، کۆدەنگی نەتەوەو گەلانی ئیسلامی؟ بەڵام خۆ ئەو دەمیش نەکرا بەمەرکەزیەت حوکمی جیهانی ئیسلامی بکرێ، بۆیە دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر بنچینەی سیستەمی ویلایەتی ئیسلامی دامەزرا کەسیستەمێکی هاوشێوەی کۆنفیدراڵییەو لەفیدراڵیەتیش زیاترە، ئێمە تەحەددای خوازیارانی دەوڵەتی ئیسلامی دەکەین ئەوانەی دژایەتی فیدراڵی دەکەن، بڕیاری مافی ویلایەتی ئیسلامی بۆ گەلی کورد بدەن، کەواتە دژایەتی کردنەکە لەئەنجامی شۆڤێنیەت و

ڕەگەزپەرستیەوەیە، ئەوەش فیتنەیەکی بەربڵاو لەنێوان موسڵمانە کوردەکان و عەرەبەکان لەعیراق دەنێتەوە، پاشان ئەگەر دوژمنانی فیدرالی توانیان دەسەڵات لەعیراقدا زەوت بکەن و کاریان بۆ ئەوەکرد دەستکەوت و مافەکانی گەلی کوردستان زەوت بکەن کەئێستا چێژی لێوەردەگرێ، ئەوە دەبێتە مایەی شەڕێکی ناوخۆ، چونکە ناتوانن ئەو دەستکەوتانەی گەلی کوردستان زەوت بکەن مەگەر بەسەر لاشەی دەیان هەزار کوژراوی خۆیان و دەیان هەزار شەهیدی کورد بازبدەن؟ ئێمە ئەوە دەڵێین و ئەو فتوایە پیرۆزەشمان لەبیرەو لەبەرچاوە کە کاتی خۆی مەرجەعی بالای شیعی زانای پایەبەرز ئایەتوڵڵا محسن الحكيم (قدس سره) و ڕەزای خوای لەسەربێ بۆ حەرام کردنی شەڕی ئەو کوردانەی دا کەداوای مافی خۆیانیان دەکرد.

بەم پێیە کوژراوانی پەلاماردەران لەنێو ئاگرو دۆزەخ و پیسترین چارەنووسدان، کەچی شەهیدە کوردەکان ئەوانەی بەرگریی لەخاك و ماڵ و خێزانەکانیان دەکەن لەبەهەشتدا شەهیدی نەمرن.

ئێمە ئەوانە هۆشدارو ئاگاداردەکەینەوە کەدژایەتی یەکێتی ئارەزوومەندانە (فیدرالی) دەکەن چیتر لەسەر گومڕایی بەردەوام نەبن و داوایان لێدەکەین لێی پاشگەزببنەوەو حەقیقەتی فیدرالی (یەککگرتنی ئارەزوومەندانە) بزانن و لێی تێبگەن، هەروەها دەرك بەقازانجە زۆرو زەوەندەکان و ڕۆڵە مێژووییەکەی و

پێویستی بوونی بکەن بۆ یەکێتیی نیشتمانیی عیراقێکی پتەو کەتواناى ژیانی هەبێت‌و بشتوانێ بەرگەی رەشەباو کارەساتەکان بگرێ. (والسلام على من اتبع الهدى) سڵاو لەوەی رێی راست دەگرێ.

## دەربارەی خۆپیشاندانی هەندێ شیعە دژی فیدرالی..
## دیاردەیەکی نامۆو شازی روخێنەرە

هەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقییەوە پەیوەندییەکانی کوردی -عەرەبی بە ئاکارو تایبەتمەندێتی دۆستایەتی و خۆشەویستی و هاوکاریو پشتگیریی داخوازییە رەواکانی هەردوولا بۆ یەکتر ناسراو بووە، کە هەردوولا پێکەوە لە عیراقدا تووشی چەوساندنەوەی تایەفی و نەتەوەیی هاتن.

هەردوو چەوسانەوەی نەتەوەیی و تایەفی، کوردو عەرەب و تورکمانیشی گرتەوە، چەوسانەوەی تایەفی هەر شیعەی عەرەبی نەگرتبۆوە، بەڵکو شیعەی کوردو تورکمانیش. کوردە فەیلییەکانی شیعە دووسەرە چێژتیان، لەچەوسانەوەیەکی تایەفیدا ماڵ و موڵکیان دەستیان بەسەردا گیراو سامانیان تالانکراو سەدان لاوی روناکبیریان گیران کە دواتر دەرکەوت لە بیابانەکانی عێراق زیندەبەچاڵ کراون. تورکمانی شیعەش تالاوی سێدارەو راگوێزان و بەعەرەبکردنی لە سەر دەستی دیکتاتۆریەتی چنگ سوور بە خوێنی سەدان ئازادیخوازی تورکمانی شیعەوە چێشت چەوسانەوەی نەتەوەییش بەتەنیا وابەستە نەبوو بە

کورد، بەڵکو شیعە تورکمان و عەرەبەکانیشی گرتەوە، ئەوانەی بە بنەچەی ئێرانی بوون تاوان کران. لەبەرئەوە کوردو شیعە لە ناخۆشییەکانیشدا هاوبەش بوون.
لەسەردەمی رەشی دیکتاتۆریشدا کوردو شیعەی (عەرەب و تورکمان) یەکدیگرو هاوپەیمان و هاوخەبات و هاوجیهاد بوون دژی دیکتاتۆریەت و لە پێناو دروشمێك کە هەموو لەسەری رێککەوتبوون کە ئەویش عیراقێکی دیموکراسیی فیدرالیی یەکگرتوو بوو کە رێز لە ناسنامەی زۆرینەی عیراقیەکان بگرێ.
ئەو هاوپەیمانێتییەی کوردو شیعە ببووە مایەی وروژاندنی ئیرەیی پێبردن و بەرهەڵستی، بە تایبەتیش لای ئەوانەی دەیانویست پێکهاتە کۆنەکەی رژێمی عیراقی بە گۆرینی تەنیا سەرەکانیەوە بهێڵنەوە.
لە کوردستانی فیدرالیشدا برا عەرەبە شیعەکان هەموو رێزو ستایشێکیان لێنرا. لەوێ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە دەستپێشخەری برامان جەلال تاڵەبانی یەکەمین حوسێنیەی هاوچەرخی جوان لەگرنگترین شەقامەکانی سلێمانیدا دروستکرا، هەروەها کوردستانی فیدرال تاکە شوێنێك بوو لەعیراق کە برا شیعەکانمان رێورەسمی چلەو ئاهەنگە ئاینییەکانیان بەبەشداریکردنی بەرپرسە حزبی و حکومییەکان و پیاوە ئاینییەکانی سوننە تێدا پەیرەو بکەن. بەدرێژایی مێژوویەکی دوورو درێژیش لای جەماوەری کوردستان ئەوە سەقامگیربوو کە برا عەرەبە

شیعەکان هاوپەیمانێکی جێی باوەڕو متمانەن‌و ئەوان دوای ئازادبوونی عیراق پشتیوانی لەگەلی کوردستان دەکەن بۆ وەدەستهێنانی مافە زەوتکراوەکانی دیکەیان.
بۆیێ جەماوەری کوردستان کاتێ خۆپیشاندانەکانی شیعەیان دیت‌و بیست لەدژی گەلی کوردو مافی لەفیدرالیدا بروسك لێیدان. ئەو هیتافانەی لەلایەن کەسانێکی نەزان‌و سادەوە دژی فیدرالی مانای ئەوەبوو ئەو فیدرالییەتە لەگەلی کوردستان زەوت بکرێ کە زیاتر لەدوازدە ساڵە هەیەتی. هەروەها کوردە ئازادیخوازەکان بروسك لێیدان کە زانییان هێندێ نەزان، یان ئەوانەی پاشماوەی بەعسی بەرکەنارکراو بوون‌و خزابوونە ریزی تاقمە شیعەیەکی پەرگیرو هاواریان دەکرد (لا الە إلا اللە کوردستان عدو اللە)و (لا الە الا اللە جلال عدو اللە)و (لا الە الا اللە مسعود عدو اللە) مەگەر ئەوە پاداشتی "سینیمار"ە(١) گەلی کورد وەری دەگرێ کە هەمیشە بەرگریی لەمافەکانی برا شیعەکان کردووە بەعەرەب‌و تورکمانەوە؟
چاکە، ئەوە گوتمان خۆپیشاندەرەکان نەزان‌و پاڵدراوبوون، بۆ دەنگێکی شیعە بەرز نەبۆوە بۆ نارەزایی دەربڕین بەرامبەر ئەو خۆپیشاندانەو ئیدانەکردنی دروشمە ئیستیفزازیەکان.؟ بۆچی بەڕێز قەبانچی لەمینبەری پیرۆزو لەگوتاری هەینیدا لەدژی فیدرالیەت قسەدەکا..؟ لەکاتێکدا ئەنجومەنی بالای شۆڕشی ئیسلامی‌و حیزبی دەعوەی ئیسلامی‌و

ڕێکخراوی کاری ئیسلامی هەر هەموویان لەکۆنگرەکانی ئۆپۆزیسۆندا بەفیدرالی قایل بوون.
ئێمە نە دەخوازین بەرگری لەبرایان مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی و نە لەفیدرالیش بکەین هێندەی پەرۆشی پاراستنی هاوخەباتی و پەیوەندییە جیهادییەکانی نێوان کوردو شیعەین، ئەو پەیوەندییانەی لەئەنجامی ئەو خۆپیشاندانانەی شیعە دژی کوردو فیدرالی دوو چاری لەرزەیەکی توندبوون.
جەماوەری میللی کوردستانیش کە بەم خۆپیشاندانانە بروسك لێیدان گەلێ نیگەران بوون چونکە لەلایەن حەکیمەکانی شیعەو سەرکردەو حزبەکانیانەوە بەرپەچ نەدرانەوەو ناڕەزاییان دەرهەق نیشان نەدرا.
مەگەر بێدەنگی لەسۆنگەی پێویست بەروونکردنەوەکردن نیشانەی ڕەزامەندییە؟ یان چی؟ یاخۆ ئەگەر نەزانەکان و ئەوانەی لەلایەن سەرکردایەتییەکی سەرەڕۆوە پاڵدراون. بەڕاستی بایەخی هاوپەیمانێتی کوردی- شیعی لەعیراق و ئایندەو مافەکانی کوردو شیعە نازانن..! ئەدی دەبێ سەبارەت بەئاقڵ و حەکیمەکان و پیاوە ئاینییە بەرزەکانی برا شیعەکانمان چی بگوترێ کە دەرهەق ئەو کردەوانە بێدەنگ بوون و هەڕەشە لەوە دەکەن برایەتی و هاوپەیمانێتی لەنێوان کوردو شیعە لەق بکەن؟ ئێمە بەوەی روویدا گەلێ نارەحەت بووین، لەبەر

ئــەو هیتافکێشــانانەش نــا کـــە دژی فیـــدرالیو سەرکردەکانی کورد لێدران، بەڵکو داخو پەژارەکان بۆ بینینی کوڵینگەکانی تێکدانو رووخاندن بوون کە ساختمانی پەیوەندییەکانی کوردیو شیعی دەرووخێنن، ئەو پەیوەندییانەی هیوایەکی زەوەندمان پێیان بوو؛ کارێکی زۆریشمان لەپێناویدا کردو لەپێناویدا زۆر شتمان، تەنانەت لەدەوڵەتە گەورەکانو دەوڵەتە عەرەبییەکانو هی دیکەش تەحەمول کرد.

ئێمە لەڕوانگەی پەرۆشیمانەوە بۆ ئەو پەیوەندییانە بانگەشەی زانا بەرزەکانو سەرکردەکانی ناو حزبە ئیسلامیە شیعیەکان دەکەین، ئەم مەسەلەیە تاووتوو بکەنو بۆشاییەکە پینەبکەن بەرلەوەی فراوانتر بێت، هەروەها پابەندی ئەو رێککەوتنو بەڵێنە بەڵگەدارانەبن.

(وذكر فان الذكرى تنفع المؤمنين)

*(سینیمار– ئەو ئەندازیارە بوو کۆشکی (خەوەرنەق)ی بۆ، شا نوعمانی کوڕی ئیمروئولقەیسی لەخمی دروستکرد، کە کۆشکەکەی تەواوکرد شا بەوە پاداشتی دایەوە لەسەر کۆشکەکەوە فرێیدایە خوارەوەو کوشتی).

# پاکتاوکردنی نەژادیی و مەترسییەکانی لەسەر یەکێتیی نیشتمانیی عیراقیدا

## ١-٢

ئەو سیاسەتی پاکتاوکردنی نەژادییەی کەسەدام حسێنی دیکتاتۆر بەزیرەکییەکی چەپەڵ و لەئیمەیەکی ئەنقەست پەیڕەوی کرد بۆ چەند مەبەستێك کراو چەند ساڵێکی بەردەوامیش جێبەجێ کرا، ئەو خشتەیەی کە لەکۆتایی ئەم وتارەدایە چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە لەماوەی ئەو ساڵانەدا نیشان دەدا، سەیر لەوەدایە دیکتاتۆریەت بەتەحەداکردنی هەستی کوردو تورکمان و پێشێلکردنی یاسا نێودەوڵەتییەکان و بەڵێننامە عیراقییە رەسمییەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان سەبارەت بەقبووڵکردنی لکاندنی کوردستانی عیراق بەدەوڵەتی عیراقییەوە، ئەو بەڵێننامانەی کەگۆڕینی نەتەوەیی و تەنانەت هەر جۆرە خۆگێل کردنێکیشی دەرهەق بەبوونی کورد لەکەرکوك حەرام کردبوو.

مەندوبی ئینگلیزی لەلیژنەی پشکنینی راستییەکان کەبڕیاردراو رایسپارد کوردستانی باشوور بەعیراقەوە بلکێندرێ، دەربارەی مەرجەکانی ئەو پێوەلکاندنە دەڵێ:

"کێشەی ویلایەتی موسڵ جارێکی دیش درایەوە کۆمەڵەی نەتەوەکان، بەو مەرجانەوە درایەوە بەعێراق داخوازییەکانی کورد لەبەرچاو بگرێ‌و فەرمانبەر لەنەتەوەی کورد یان (رەگەزی کوردی) بۆ هەڵسوڕاندنی وڵاتەکەیان‌و راپەراندنی کاروبارە دادگاییەکان‌و خوێندن لەخوێندنگاکان دابمەزرێنێ‌و زمانی کوردی ببێ بەزمانی رەسمیی لەهەموو ئەو فەرمانگەو دەزگایانەدا.

ساڵی ١٩٣١ کەعێراق خەریك بوو داوای چوونە ناو کۆمەڵەی نەتەوەکان بکات، بەراسپاردەی بەریتانیا حکومەتی ناوەندی یاسای زمانەکانی ناوخۆی دارشت کەتێیدا ئەو ناوچانە دەستنیشان کراون کەدەیانگرێتەوە، ئەویش وەك دووپاتکردنەوەیەك بۆ نیازپاکیی دەرهەق بەکوردو جێبەجێکردنی مەرجەکانی پرۆتۆکۆلی ویلایەتی موسڵ"

ساڵی ١٩٣٢یش لەگەڵ کۆتایی هاتنی ئینتیدابی بەریتانی‌و وەرگیرانی عێراق لەکۆمەڵەی نەتەوەکان، سەرلەنوێ عێراق لەبەیانێکی رەسمیدا کەهێزی دەستووری درابوێ‌و پێشکەش بەو رێکخراوە جیهانییە کراو بووە وەسیقەیەکی نێودەوڵەتی، ئەم پرەنسیپانەی راگەیاندەوە.

جگە لەو وەسیقە نێودەوڵەتییانەش، حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی، بەسیفەتی ئەوەی کەدەوڵەتی ئینتیدابکەر بوو لەگەڵ حکومەتی پاشایی عێراقیدا

لەماوەی جیاجیادا چەند بەیانێکی ڕەسمییان دەرکرد کەتیایدا دان بەمافەکانی کورد نراوە لەسەر شێوەی بەڵێندان بۆ جێبەجێکردنی، بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئەو بەیان و بەڵێنانە هەر بۆ ئەوە ڕاگەیەندرابوون و درابوون تا بەسەر چەند بارودۆخ و هەڵویستێکی شلۆق زاڵ ببن کە لەگەڵ نەمانی پێویستیی پێکهاتنەوە لەبیرکران، لێرەدا نامەوێ لەبەیانێك زیاتر باس بکەم لەو بەیانانەی کە لەکاتی گفتوگۆی لۆزاندا لەکانوونی یەکەمی ١٩٢٢ بڵاوکرایەوە: "حکومەتی خاوەن شکۆو حکومەتی عیراقی دان بەوەدا دەنێن و بڕیاردەدەن کە کوردەکان مافی پێکەوەژیانیان لەچوارچێوەی عیراقدا هەیەو مافی ئەوەشیان دەبێ حکومەتێکی کوردی لەناو ئەو سنوورەدا پێك بێنن، هەروەها ئەو دوو حکومەتە هیوادارن لایەنە کوردییەکانی پەیوەندار لەنێوان خۆیاندا لەسەر شێوەی ئەم حکومەتەو ئەو سنوورە ڕێك بکەون کەدەخوازن بیگرێتەوەو نوێنەری دەمڕاستیان ڕەوانەی بەغدا بکەن بۆ ئەوەی سەبارەت بەپەیوەندی ئابووری و سیاسیمان لەگەڵ حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی و حکومەتی عیراقیدا گفتوگۆ بکەن".

ئەمەش بەباوەڕی من بەیانێکی گرنگ و ڕوونی یەکلاکەرەوەیە، دەمەوێ سەرنجیشتان بۆ ئەوە ڕابکێشم کە:

یەکەم: بەکارهێنانی رستەی (حکومەتی کوردی) کە لەئۆتۆنۆمی نێو چوارچێوەی کۆماری عیراقی گەلێ هەورازترە لەداخوازیی رەسمیی ئێستای کورد، (١٩٦٦).

دووەم: رستەی (ئەو کوردانەی لەناو سنووری عیراقدا دەژین) لەجیاتی (ئەو کوردانەی لەناو سنووری ویلایەتی موسڵی عوسمانی دەژین).

سێیەم: داوا لە کورد بکرێ کە ئەو سنوورە گونجاوەی حکومەتی کوردی دەستنیشان بکەن.

نوێنەری بەریتانیا لەلیژنەی کۆمەڵەی نەتەوەکاندا لەقسەکانی بەردەوام دەبێ و دەڵێ: "جگە لەوەی کەهەموو قەزاکانی لیوای کەرکوك یاسای زمانی ناوخۆ دەیانگرێتەوە، فەرامۆشکردنی مۆرکی کوردیی ئەم لیوایە (کەرکوك) خۆی لەخۆیدا بەزاندنێکی ترسناکی ئەو بەڵێنانەیە کە بەکۆمەڵەی نەتەوەکان دراوە، "مستەر س.ج ئەدمۆنز نوێنەری بەریتانیا لەلیژنەی کۆمەڵەی نەتەوەکان و نوێنەرە سیاسییەکەی لەکەرکوك تا ئەوکاتەی کرا راوێژکار لەوەزارەتی ناوخۆی عیراقیدا" لەموحازەرەیەکیدا لەکۆمەڵی پاشایی ئاسیای ناوەڕاست رۆژی ٢٥/١٠/١٩٦٦.

بەرێزان سەرنج بدەن چۆن کوردستانی باشوور بەمەرجی روون و ئاشکرا درایە عیراق، کەتەنانەت رەتکردنەوەی مۆرکی کوردانەی لیوای کەرکوك خۆی لەخۆیدا بە بەزاندنێکی ترسناکی ئەو بەڵێنانە

دەژمێردرێ کەدرابوونە کۆمەڵەی نەتەوەکان، ئەوە جگە لەپاکتاوکردنی نەژادیی تێیداو دەرکردنی کوردو نیشتەجێکردنی عەرەبی هاوردە لەشوێنی ئەواندا، کەئەمە رووخاندنی بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکانە بەلکاندنی کوردستانی باشوور بەعیراقەوەو دواتریش پووچەڵکردنەوەو لابردنیەتی.

کەئەمەش بەکردەوە مانای ئەوەیە، ئەوانەی ئەم سیاسەتە تاوانکارییەیان گرتۆتەبەر، کوردستان لەعیراق جودا دەکەنەوەو یەکێتی نیشتمانیی عیراق بەشێوەیەکی یاسایی و نێودەوڵەتی دەڕووخێنن، بەم پێیەش کەنەتەوە یەکگرتووەکان واریسی شەرعی کۆمەڵەی نەتەوەکانەو ئەو بەڵێن و بڕیارانەی پێشکەش بەو کراون ئەوە دەگەیەنێ کە نەتەوە یەکگرتووەکان دەتوانێ حکومەتی عیراقی ناچار بکات رێز لەبەڵێنەکانی خۆی بگرێ و مەرجەکانی لکاندنی کوردستان بەعیراقەوە جێبەجێ بکات، هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کە وازهێنانی حکومەتی عیراقی لەو مەرجانە-هەر حکومەتێکی عیراقی-و جێبەجێنەکردنی؛ وازهێنانە لەو یەکێتییە عیراقییەی کە بەپێی ئەم بڕیارە نێونەتەوەییە دامەزراوە، بۆیە پێویستە هەر هەمووماﻥ ئێمەی پەرۆشی ئەو یەکێتییە نیشتمانییەی عیراق ئەو مەرجانە جێبەجێ بکەین کەمەرجی عادیلانەو شەرعین، دەنا بوارێکی فراوان بۆ تەیارێکی جوداخوازی کورد خۆشدەکەین پەنابباتە بەر

نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەو یەکێتییە عیراقییە بکات کە لەسەر بنچینەی لکاندنی کوردستانی باشوور بەعیراق پێکهاتووەو سەرلەنوێ داوای مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلی کورد بکات، یانیش دەرفەت بۆ خوازیارانی ویلایەتی موسڵ بڕەخسێنین بۆ ئەوەی کۆتایی بە لکاندنەکەی بەعیراقەوە بێنن.

جا برایانی بەڕێز لێمان گەڕێن با کێشەکانمان لەنێو خۆماندا چارەسەر بکەین، بەعەرەب و کوردەوەو دان بەمافە ڕەواکانی گەلی کورد بنێین بەمافی چارەی خۆنووسینیشەوە لەچوارچێوەی دەوڵەتی عیراقیدا، با هەمووشمان سوپاسی خوا بکەین کە ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان بەکۆی دەنگ بڕیاری لەسەر پەیڕەوکردنی ئەم مافە دا لەشێوەی یەکگرتنی ئارەزوومەندانە (فیدرالی) لەگەڵ گەلی عەرەبی برای لەعیراقدا.

پێمان خۆشە ئەوەش بڵێین کەمەترسییەکانی پاکتاوکردنی نەژادیی بەتەنیا پەیوەست نییە بەجیاکردنەوەی یاسایی کوردستانی باشوور لەعیراق، بەڵکو بۆ گەلێك مەترسی جیددی دیکەش پەل وپۆ

---

١-پاکتاوکردنی نەژادیی یەکێتیی نیشتمانیی مینرێژدەکات:

گومانی تێدا نییە کە یەکێتیی نیشتمانیی راستەقینە پێك نایەت ئەگەر لەسەر بنچینەی ئارەزووی هاوبەشی لایەنەکان و پێکەوەژیان نەبێ، لەسایەی یەك دەوڵەتداو لەسەر بنەمای یەکسانی و رەتکردنەوەی چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و تایفەگەری و رێزگرتنی مافە رەواکانی هەمووان.

ئەگەر لایەنێك هەستی بەوەکرد خاکەکەی زەوت دەکریٚ و رۆڵەکانی دەربەدەر دەکرێن و بەبەرچاویەوە خەڵکانی نامۆ بەناوچەکەی بەزۆر لەجێی رۆڵە دەرکراوەکانی نیشتەجێ دەکرێن و مافەکانی پێشێل دەکرێن، ئەوە شتێکی سروشتییە کە هەست بەیەکسانی ناکات و بەڵکو بەئازاری چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و زوڵمەکانی دەتلێتەوەو قەت بۆ ئەم یەککگرتنە دڵسۆز نابێ و کەیفی پێ نایێ و بەرگریی لێ ناکات و ئەگەر بتوانێ قەبوڵیشی ناکات، بەم جۆرە ئەو یەککگرتنە یەککگرتنێکی مینرێژکراو دەبێ و هەر ئان و ساتێك بتەقێتەوە، دەتەقێتەوە. ئەمە جگە لەوەی کە تۆوی دوژمنکاری و کینە لەنێو هاوولاتیاندا بەخۆوە دەگرێ، پاشان چۆن یەککگرتنێك دەپارێزرێ و پتەودەکرێ ئەگەر لەسەر بنچینەی زەوتکردنی موڵکی هاوولاتیان و دەربەدەرکردنیان لەخاکی باب و باپیرانیان پێك هاتبێ؟ هەروەها چۆن مێژووش سەلماندوویەتی یەکێتیی نیشتمانیی هەر ولاتێك بەبێ دیموکراسی و یەکسانی لەنێوان هاوولاتیانی و رێزگرتن لەهەموو

مافـەكانیان ناپـارێزرێ، بۆیـە پاكتـاوكردنی نـەژادیی مینرێژكراوەو پاشماوەكەشـی یـەكێتی عـیراقی مینـرێژ دەكات، لەبەر ئەوە دەبێ خەبات بكەین تا بەپەلە خۆیو شوێنەوارە تاوانكارییەكانی لەناوببردرێن.

٢-پاكتـاوكردنی نـەژادیی پێچەوانـەی مافـەكانی مرۆڤە:

پاكتـاوكردنی نـەژادیی بەشـێوەیەكی ئاشـكرا پێچەوانـەی بیروباوەڕەكـانی جاڕنامـەی جیـهانی مـافی مرۆڤە كە حكومەتی عیراقی خۆی ئیمزایكردووەو بۆتـە بڕوانامەیـەكی نێودەوڵـەتی كەهـەموو دەوڵەتـەكان بەدەوڵەتی عیراقیشەوە پابەندن بەجێبەجێكردنی.

لـێرەوە راگوێزانـی نەتەوەیـەكی ژێـر دەسـەڵاتی حكومـەتێكی دیكتاتۆری لەسـەر خـاكی بابو باپـیرانی كردەوەیـەكی تاوانكـاریی پێچەوانـەی مـافی مرۆڤـە كـە دەبـێ بەئـەمان لـەوڵاتو نیشـتمانەكەی خۆیـدا بـژی، پاكتاوكردنی نەژادیی لەناوچەكانی كوردستانی عـیراق پـەیڕەوكرا، هـەر لەشـەنگالو شـێخانو مـەخمورو كـەركوكو خورمـاتووەوە بیگـرە تـا دەگاتـە خانـەقینو مەندەلیو بەدرەو جەسان.

نامیلكەیـەك بڵاوكراوەتـەوە كەپـەنجا بەڵگەنامـەی رەسمیـی عـیراقی تێدایـە سـەبارەت بەجێبـەجێكردنی پاكتـاوكردنی نـەژادیی دەرهـەق بـەكوردو توركمـان، لەبڕیارێكی بەناو ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش لـە ٢٠/١٠/١٩٨١دا بڕیـاردراوە كۆمـەڵگاو خـانوو

لەپارێزگاکانی ناوەڕاستو باشوور بۆ ئەو کوردە ڕاگوێزراوانە دروست بکرێن کە لەناوچەکانی نیشتەجێبوونیانەوە ڕادەگوێزرێن. لەبڕگەی (١٦)دا بڕیاردراوە فەرمانبەرو کرێکاری کورد بەپلەی دووەمو تورکمان بەپلەی یەکەم لەپارێزگای کەرکوکەوە بگوازرێنەوە بۆ باشووری عیراق، لەنووسراوێکی نهێنیو تایبەتیو بەئیمزای تەها جەزراوی خائین کە بۆ پارێزگای کەرکوکی ناردووە داوا دەکات خێزانە کوردەکان ئەوانەی لەناوچەکانی قەرەحەسەنو لەیلانو تازەو شاری کەرکوك نیشتەجێبوونو لەپرۆسەی ئەنفالەکاندا گوندەکانیان خاپوورکرابوو بۆ پارێزگاکانی ناوەڕاستو باشوور جگە لە (بەغدا- سەلاحەدین-دیالە) ڕابگوێزرێن، بەگوێرەی ئەو نەخشەیەی بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە کێشاویانە.

بڕیاری ژمارە ١٣٦٧/١٤ لەڕۆژی ١٩٩٤/١٠/٣١و لەبڕیارێکی پارێزگای کەرکوك بەئیمزای فەریق ڕوکن هیشام سەباح فەخری ژمارە ٧٤٣١ لە ١٩٩٥/٧/١٨دا داوادەکات هەموو گرێبەستە کشتوکاڵیەکانی جوتیارانی غەیرەعەرەب لەکوردو تورکمان هەڵبوەشێندرێنەوە، ئەمە لەگەڵ ئەوەی کەهەموو زەویە کشتوکاڵییەکان خۆماڵی کرابوونو ببوونە موڵکی دەوڵەت.

بڕیاری ژماره س/٥٩٣٦/١٧ لەرۆژی ١٩٩٥/١١/٤ بەئیمزای فەریق ئەیاد فتەیح ئەلڕاوی پارێزگاری تەئمیم (کەرکوك) داوای ئەوه دەكات:

هەموو ئەو زەویانەی دەكەونە ئەم دوو شوێنەی سەرەوه (ناحیەی ئاڵتون كۆپری هەردوو موقاتەعەی ٤٩، ٣٧ كەدەكەونە دەشتی ساڵەیی-رێدار) بەسەر جوتیاره هاوردەكانی رۆڵەكانی هۆزی (زەوبەعی)ی عەرەب دابەش دەكرێن و سێ هەزار دۆنم بۆ سەرۆكی هۆز (نەجم قادر محمد) تەرخان دەكرێ. دەك سڵاو لەئیشتراكیەتی عەفلەقی فاشیست كە بەپێچەوانەی هەموو یاساكانی چارەسەركردنی كشتوكاڵی تەنانەت ئەوانەی دوای كودەتا بەعسییەكەی ١٩٦٨یش دەرچوون، دەرەبەگایەتی زیندوودەكاتەوه.

وەك نموونەیەك بۆ راگوێزانی كوردو توركمان بەشێكی ئەو بڕیاره وەردەگرین كە بەژماره ٢١٦٥/٦/٣ بەئیمزای لیوا روكن نۆفەل ئیسماعیل خچیر-ی پارێزگاری كەركوك دەرچووەو ئەمەیە:

لەخوارەوه زانیاریتان دەربارەی راگوێزانی هاوولاتیانی ناعەرەب لەپارێزگای تەئمیم (كەركوك) بۆ ناوچەكانی ئۆتۆنۆمی یان پارێزگای ئەنبار بۆ دەنووسین و لەبەر رۆشنایی رێنماییە مەركەزییەكانی ١٩٩٨/١/١ تا ١٩٩٨/٢/٣١ و بەم شێوەیە:

١-ژمارەی خێزانە كوردە راگوێزراوەكان سەدوحەفتاو دوو خێزانە.

٢-ژمارەی خێزانە ڕاگوێزراوەکان حەڤدە خێزانن.
کۆی خێزانە ڕاگوێزراوەکان (١٨٩) خێزانن.
لەنووسراوێکی دیکەشدا کە لەسەرۆکایەتی کۆمارییەوە بۆ پارێزگای تەئمیم (کەرکوك) نارداوە دەڵێ: سەرۆك بڕیاریدا کەگرێبەستە کشتوکاڵییەکان موڵك نینو پرۆسەی دابەشکردنیان بەسەر هۆزە عەرەبییەکاندا بەگوێرەی پلانی ژمارە ٧٢٢/٢٠ لە ١٩٩٩/٣/٢٣دا بەردەوام دەبێ، جگە لەوە دەیان بڕیاری بۆ جێبەجێکردنی پلانی پاکتاوکردنی نەژادیی تاوانکارانە هەنو هەر هەمووشیان پێچەوانەی مافەکانی مرۆڤن، لەوانە بڕیاری ژمارە ٩٣١/٧/٨ لە ٢٠٠٠/١/١٨دا کەدەخوازێ سێ سەد خێزانی کوردو تورکمانی مەرکەزی کەرکوك لەساڵی (٢٠٠٠)دا ڕابگوێزرێن. هەروەها بڕیاری ژمارە ٧١٣/٩/٩ لە ٢٠٠٠/١/٢٦دا کەتێیدا باس لەجێبەجێکردنی پلانی پێنج ساڵەی دەکات لە ١٩٩٥/١/١ بۆ ١٩٩٩/١/١ سەبارەت بەڕاگوێزانی هاووڵاتیانی غەیرە عەرەب بۆ دەرەوەی پارێزگای کەرکوك.

## زمانی سەردەم

بەڕووخاندنو لەناوبردنی ڕژێمە دیکتاتۆرو دزێوەکەی سەدام حسێن، خەڵکی کوردستان هەرەشەیەکی گەورەو زەبەلاحیان لەکۆڵ بووەوەو دەستکەوتو ئامانجەکانیان لەکەناری دڵنیایی نزیك کردووەتەوە، بەلام سەرەڕاش، چەسپاندنو

بەپاساییکردنی ئەو دەستکەوتو ئامانجە رەوایانەو جێکردنەوەیان لەیاسای ئیدارەدانی عیراقو دەستووری ئەو وڵاتەدا لێزانیی و وەستایی سیاسیی دەوێت، ئەمەش لەبەر ئەوە نا کە ئەو خواستو داواکارییانەی کورد واقیعیانە نینو لەگەڵ هاوکێشە سیاسیی و دەرکەوتو گۆڕانکارییەکاندا ناگونجێن، بەڵکو لەبەر ئەوەی عیراق لەڕووی پێکهاتەکانیەوە وڵاتێکی تێکچڕژاوو لەسەردەمی ئێستادا ماندووی دەستی سیاسەتە نارەواکانی رژێمی بەعسو ئاسەوارەکانی ئەو سیاسەتانەیە.

بەدیویێکی تریش، لەسەردەمی دەستکەوت کۆکردنەوەدا مەرج نییە ئەوەی دوێنێ بەڵێنی پێدەداین ئەمڕۆ قسەی خۆی قووت نەداتەوە، لەبەر ئەوەیە کەدەبینین سەرکردایەتی سیاسی کوردستانیش خۆی بۆ ئەو ئەرکە مێژووییەو یەکلاییکەرەوە ئامادەکردووەو کار بۆ ئەوە دەکات کە بەزمانی ئێستا گەمە سیاسییەکە ئیدارەبدات و لێنەگەڕێ لەژێر هەر گوشارو ناونیشانێکدا بێت مافەکانی گەلەکەمان مقەستی بێویژدانیان بخرێتە گەردن.

لەو نەبەردییە دیپلۆماسییەشدا: وەك هەردەم هەڵسوڕانی هەڤاڵ مام جەلال، هەڵسوڕانی سەرکردەیەکی بەئەزموونی خەمخۆرە کەخەمی هەموو نەتەوەو ئاینو تایفەکانی کوردستانو عیراقی لەبەرە، زمانی مام جەلال، زمانی سەردەمو پشت بەستن

بەڕاستییە مێژووییە چەسپاوەکانو گەڕانەوە بۆ دۆکیومێنتو ژمارەو نەخشە موعتەبەرە دێرینەکانە، نەك دروشمی بریقەدارو خیتابی هەست بزوێنەر.
ئەوەتا لەکۆبوونەوەی رۆژی (٢٠٠٤/٢/٩)ی ئەنجومەنی حوکم لەدوو توێی وتارێکی تێروتەسەلو هەمەلایەنو مێژووییدا، مام جەلال جارێکی تریشو لەجومگەو وێستگەیەکی هەستیاری تری تێکۆشاندا بووەوە ئەو سەرکردە داکۆکیکارەی مافەکانی خەڵکی کوردستان کە بەوتەو توانا دیپلۆماسییو لیاقە سیاسییەکەی دەیسەلمێنێت کە:
*پێویستە قانونی حوکم، فیدرالی کوردستانی عیراق بسەلمێنێتو بڕیاربدات دەست بەتەتبیعی وەزعی لیوای پێشووی کەرکوك بکرێت.
*هەقی سادەی کوردە کەزمانی کوردیش شانبەشانی زمانی عەرەبی بەزمانی رەسمیی دابندرێت.
*بەپشت بەستن بەدۆکیومێنتە مێژووییەکان، هەرگیز سنووری عیراق لەجەبەلحەمرین تێنەپەڕیوە.
*پێویستە دەستبەجێ شوێنەواری پاکتاوی رەگەزییو بەزۆر تەعریب بسڕدرێتەوەو هاوردەکان بگەڕێنەوە شوێنی خۆیانو ئاوارەی کوردو تورکمانیش بچنەوە شوێنی خۆیان.
*بەپێی خەریتەیەکی مێژوویینی گەورەی زەمانی عوسمانی-ش کەرکوك بەشێکە لەکوردستان.

مام جەلال لەوتەکەیدا کە بەبەڵگەی حاشاهەڵنەگر تێرکرابوو هەوڵیدا ئەندامانی ئەنجومەنی حوکم بهێنێتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەو مافانەی ئەمڕۆ گەلی کوردستان داوایاندەکات لایەنی کەمی خواستەکانیەتی، ئیتر بەچ هەق و ویژدانێك ئەوەشمان پێ ڕەوانەبینرێت و کۆسپ و تەگەرەیان لەبەردەمدا قوتبکرێتەوە!

بەمشێوەیە دەبینین کە هەڤاڵ مام جەلال دەزانێت چۆن لەکات و ساتی شیاو و گونجاودا، لەتەوقیتی باش هەڵبژێردراودا، قسەی خۆی دەکات و بوێرانەو راشکاوانە بەرگریی لەئامانجە دێرینەکانی کوردایەتی و مافە رەواکانی خەڵکی کوردستان دەکات و تەمومژەکان دەرەوێنێتەوەو پاساوەکانی دەستی ناحەزان بۆ دژایەتیکردنی گەلەکەمان، نابووتدەکاتەوە.

# پاکتاوکردنی نەژادیو مەترسییەکانی لەسەر یەکێتیی نیشتمانیی عیراقیدا

-٢-

هەروەها پاکتاوکردنی رەگەزیی لەڕووی فەرهەنگیو فێرکردنیشەوە پێچەوانەی مافەکانی مرۆڤە، وەك چۆن عەفلەقییەکان بەم شێوەیەی خوارەوە لەکەرکوك وەك (نموونەیەك بۆ ناوچەکانی دیکە) پەیڕەویان کرد.

لەبڕیاری وەزارەتی ناوخۆ (کاروباری ئەمنی) ژمارە ١٢١٣٦ی رۆژی ٢١/٩/١٩٩٩دا هاتووە: پێویستە سەرجەم خوێندکارەکانی پارێزگا (کەرکوك) بەم رێنماییانەی خوارەوە پابەند بکرێن:

یەکەم: پەروەردەو فێرکردنو خوێندن لەهەموو قۆناغەکانی (باخچەی ساوایان-سەرەتایی-ناوەندیی-ئامادەییەکانی ئەکادیمیو پیشەییو پەیمانگاو کۆلێژەکان)دا تەنیا بەزمانی عەرەبی دەبێت، بۆیە دەبێت پەیڕەوی ئەمانە بکرێ:

أ-بڕای بڕ بەکارهێنانی زمانە ناوخۆکانی (کوردی-تورکمانی-ئاشووری-کلدانی) بۆ دەستەی فێرکردنو دەستەی وانەگوتنەوە قەدەغەیە لەکاتی وانە گوتنەوە، یان بەکارهێنانی وشەو رستەی سەخت لەکاتی دەوامی رەسمیدا بەزمانی عەرەبی نەبێ.

ب-بڕای بڕ بەکارهێنانی ئەو زمانانەی کە لەسەرەوە لەبڕگەی یەکەمی نووسراوماندا ئاماژەیان

پێکراوە بەکارهێنانیان لەلایەن دەستەی فێرکردنو وانە گوتنەوە لەگەڵ خوێندکاراندا لەماوەی پشووداندا قەدەغەیە.

بەکەمێك وردبوونەوە لەم بڕیارە ڕەگەزپەرستانەو فاشیانەدا دەردەکەوێ کەعەفلەقییەکان:

١-پابەندبوونی عیراقیان لەبەردەم کۆمەڵەی نەتەوەکانو نەتەوە یەکگرتووەکانداو لەبەیانەکانی پێشتریدا نەهێشت کە بەکارهێنانی زمانەکانی ناعەرەبییە لەقوتابخانەکاندا.

٢-تەنانەت ئەوەش قەدەغە دەکات مامۆستایان رستە سەختەکانیش بەغەیری زمانی عەرەبی شیبکەنەوە.

٣-لەمامۆستایان قەدەغە دەکات لەکاتی پشووشدا زمانەکانی غەیرە عەرەبی بەکاربێنن.

٤-لەخوێندکاران قەدەغە دەکات لەنێوان خۆشیاندا بەزمانی دایك بدوێن.

ئەم نموونەیەی فەرمانی دیکتاتۆری کەپێچەوانەی مەرجەکانی لکاندنی کوردستانی باشوورە بەبڕیارێك لەکۆمەڵەی نەتەوەکانەوە بەعیراقەوە دەربڕینێکی حاشاهەڵنەگرە کە دیکتاتۆریەت ئەو پابەندییە عیراقییە دەولیانەی پێشێل کردووەو گاڵتەجاڕیی بەو گفتو بەڵێنە عیراقییانە کردووە بەرامبەر دامەزراوە دەولییەکان.

هەروەها عەفلەقییەکان هەموو سنوورێك و ڕەهەندێکیان بەزاند بەبڕیارێکی فەریق ڕوکن سەعدون عەلوان ئەلموسلیح-ی بریکاری وەزارەتی ناوخۆ بۆ کاروباری ئاسایش لەڕۆژی ۱۹۹۸/۸/۲۱ و بەژمارە (۱۰۸۵) تەنانەت ناونیشان هەڵگرتنیشی لەکوردو تورکمان قەدەغەکردووە، بەم جۆرە دەبینین سیاسەتی پاکتاوکردنی نەژادیی ڕەگەزپەرستانە ڕاگوێزان و بەعەرەبکردنیش دەگرێتەوە، تەنانەت بەعەرەبکردنی خوێندن و قسەکردن بەزمانی دایکیش.

هەر بەوانەش نەوەستاوە کەپێشتر روونکرانەوە، بەڵکو ئەوەش دەگرێتەوە کەخەڵکی کوردو تورکمان ناچارکراون نەتەوەکەیان بگۆڕن، جگە لەدەربەدەرکردنی دەیان هەزار خێزانی کوردو تورکمان لەپارێزگای کەرکوك و خانەقین و نیشتەجێکردنی عەرەبی هاوردە لەباشوور لەشوێنیاندا، ئێمە دەبینین کەگۆڕینی نەتەوە بەزۆرداری و ناڕەزایی و تۆقاندن و هەڕەشەلێکردن ئەنجامێکی ترسناکی دیکەی ئەم سیاسەتە ڕەگەزپەرستانەیە کەنەگونجاوە لەگەڵ برایەتی و خۆشەویستی نێوان هەموو عیراقییەکان و پێچەوانەی مافەکانی مرۆڤ و حوکمەکانی ئایینی ئیسلامی پیرۆزە کەخوێن و ماڵ و ناموس و زەوی موسڵمانی لەبرای موسڵمانی حەرام کردووە، ئەم سیاسەتە ڕەگەزپەرستانەیە لەگەڵ شەرعی ئیسلام

یەکناگرێتەوەو پێشێلکردنێکی ترسناکی برایەتی ئیسلامییە.

٣-ناچارکردنی کوردو تورکمان بەگۆڕینی نەتەوەکەیان بۆ عەرەب.

یەکێ لەو تاوانە نەگریسانەی دیکتاتۆریەت هاوشان لەگەڵ سیاسەتە رەگەزپەرستانەکەی ئەنجامیدا ناچارکردنی کوردو تورکمان بوو بەگۆڕینی نەتەوەکەیان بۆ عەرەب، بڕیاری ژمارە (١٩٩)ی ٢٠٠١/٩/٦ بەناوی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە دەرچووە کە لەڕاستیدا ئەنجومەنی سەرکردایەتی هەڵگەڕانەوەو خیانەتو تاوان بوو عەقلیەتی عەفلەقی فاشیستانە بەرجەستە دەکات کە بناغەی فیکریی ئەو سیاسەتە رەگەزپەرستانە فاشیستیانەیە کە بەعس بەم شێوازەی خوارەوە رازاندبوویەوە.

"وەك گونجانێك لەگەڵ بیروباوەڕەکانی حزبی بەعسی عەرەبی، عەرەب ئەو کەسەیە کە لەنیشتمانی عەرەبیدا دەژیو بەعەرەبی دەدوێو عروبەی وەك نەتەوە هەڵبژاردووە، بۆیە بەپێی حوکمەکانی بڕگەی (١) لەماددەی چلو دووی دەستوور، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ئەم بڕیارەی دا.

"یەکەم هەر عیراقییەك هەژدەساڵی تەمەنی تەواوکرد مافی ئەوەی هەیە نەتەوەکەی بگۆڕێ بۆ نەتەوەی عەرەب".

تـا ئـێره لاریمـان لـەوه نییـه کـه هـەر کەسـێك مـافی خۆیەتی سەرپشك بێ بەویستی ئازادانەی خۆی، خۆی بکاتــه عــەرەب و کوردبوونـــی خــۆی بکاتــه عـــەرەب، نموونەیـەکی زۆریـش لـەم بارەیـەوه هـەن، دکتـۆر (ومیـچ عمر نقمی) لەرەچەڵەکی خانەوادەیـەکی دێرینـی کفری-یەو نـەوەی (عمـر نقمـی)ی وەزیـری کـوردی ناوخۆیـەو وەك سـەرکردەیەکی نەتــەوەی عـــەرەب کاردەکـــات و هەمیشـەش جێگـەی رێـزی ئێمه بووه، هـەروەها خـەڵکی دیکـــەی وەك (عونـــی القلمچـــی) کۆیـــی کـــورد، کـــه لەبزووتنـەوەی نەتـەوەیی عەرەبییـەوه چووه ئیشـتراکی و دواتـر مارکسـی لینینـی و پاشـان بـووه بەرهەڵسـتکارێکی توندی رژێمی بەعس و ئینجا بەسەلامەتی گەڕانەوەی بۆ بنکەکــــەی خـــۆی وەك نەتەوەپەرســـتێکی عـــــەرەب و بانگەشــەی بــۆ پێکهاتنــەوه کــرد لەگــەڵ حکومـــەتی فاشیســــــتی ســـــــەدامی و ئێســــــتاکەش یەکێکــــــه لەسەرسـەختترین دژایەتیکـەرانی مـافی گـەلێك کـەخۆی شــەرەفی ئینتیمــابوونی بـــۆ ئـــەو گەلـــه لەدەســـتداوە، دژایـەتی سـادەترین مـافی گـەلان دەکـات لـەم سـەردەمەدا کەفیدرالییه.

ئێمـه رێگـه لـەکوردێك نـاگرین خـۆی بەعـەرەبکردنی خــۆی هــەڵبژێرێ، دەبــا ئــەو بەرێزانـــه دیــاریی گـــەلی کوردستان بن بۆ عروبه، خێرو شەرپیانەوه، هـەر لەتـەها جەزراوی تاوانبارەوه بگره تا دەگاتـه قەلـەمچی و دکتـۆر ومیچ عمـر نقمـی کەئێسـتاش لای ئێمـه جێگـای رێـزه،

بەلام ئەوەی لەسەر زەمینی واقیع روویدا ناچارکردنی تورکمان و کورد بوو بەزۆرداریی و هەڕەشەو گوڕەشە بۆ ئەوەی نەتەوەکەیان بگۆڕن، خۆ ئەگەر یەکێك رەتیکردبایەوە ئەوا لەماڵەکەی خۆی لەکەرکوك دەردەکراو لەنێوان چوونی بۆ باشووری عەرەبی بەخۆی پرپاسکەیەوە یان چوونی بۆ ناوچە ئازادکراوەکان سەرپشك دەکرا بێ ئەوەی رێگای بدرێتێ ناوماڵ و ئەو موڵکانەی کەدەگوازرێنەوە لەگەڵ خۆی ببات، جگە لەوەش بڕیاری دیکەی ناڕەوا هەن کەهاوولاتیانی کوردو تورکمان ناچاردەکەن ببنە عەرەب و واز لەنەتەوەکەی خۆیان بێنن، لەبڕیارێکی لیوا روکن نۆفەل اسماعیل خچیر-ی پارێزگاری کەرکوك ژمارە ۹۳۱/۷/۸ لە ۲۰۰۰/۱/۱۸ ئەم دەقەی خوارەوە هاتووە:

پێویستە لیستێك بەناوی (۳۰۰) خێزانی کوردو تورکمانی دانیشتووی سنووری پاریزگای (کەرکوك)بنێرن بۆئەوەی لەساڵی(۲۰۰۰)دا رایانگوازین، لەگەڵ روونکردنەوەی هۆکارەکانی بەگوێرەی رێنماییە مەرکەزییەکان کە ئەم توێژانە دەگرێتەوە:

یەکەم: ئەو هاوولاتییە کوردو تورکمانانەی نەیانویست نەتەوەکەی خۆیان راست بکەنەوە بەڕەچاوکردنی ئەوانەی ماڵ و موڵکی تایبەتی وەك خانووو زەوی و زاریان هەیە.

لەبڕیارێکی دیکەشدا کە بەئیمزای (سعدون علوان المصلح)ی بریکاری وەزارەتی ناوخۆیە بۆ کاروباری ئەمنی، ئاراستەی پارێزگاری کەرکوك (تأمیم) کراوە، نووسینگەی تایبەت ئەمە دەقەکەیەتی:
"پێویستە کارمەندەکانی فەرمانگە ڕەسمییەکانی دەوڵەت، ڕەسمی و ناڕەسمی سنووری ئیداریتان پابەند بکەن بەیاسای ڕاستکردنەوەی نەتەوەکەیان بەپێی پرەنسیپە تایبەتییەکان و لەماوەی (٣٠)ڕۆژدا لە ١/٣/٢٠٠٠وە جێبەجێ بکرێ، بەپێچەوانەشەوە هەموو شێوازێکی تایبەت دەرهەقیان بەکاردێ و ئێوەش تەواوی دەسەڵاتتان هەیەو لەئەنجامەکەشی ئاگادارمان بکەنەوە".
بەم جۆرە دەبینین کەناچارکردن و پەیڕەوکردنی کردەوەی تایبەت جێگەی هەقیان گرتۆتەوە سەبارەت بەگۆڕینی نەتەوە، بەم شێوەیە سیاسەتی ڕاستەقینە، سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی بنیاتنراو لەسەر پابەندکردن و ناچارکردنی بەعەرەبکردنی کوردو تورکمان روون دەبێتەوە کە بەشێکی گرنگە لەسیاسەتی پاکتاوکردنی نەژادیی سەدامیانەی فاشیستیانە. کردەوە ڕەگەزپەرستییە سەدامییەکان هەر بەوە نەوەستا کەباسمانکرد بەڵکو بەعەرەبکردنی تەواوی خوێندنگاو دەرکردنی کوردو تورکمانیشی لەفەرمانگەکان گرتەوە، هەروەها گۆڕینی ناوەکانیش

کە بەبەڵگە روونی دەکەینەوە، وەك چۆن پێشتریش روونمان کردبۆوە.
بڕیارێکی دیکەی ناڕەواو زاڵمانە هەیە سەبارەت بەقەدەغەکردنی ناوە کوردییەکان لەبازاڕو دوکانەکانیشدا، لەبڕیاری ژمارە ٨١٢/١١/٨ لە ٢٠٠٠/١/١٣دا لیوا روکن نۆفەل اسماعیل خضیر-ی پارێزگاری کەرکوك فەرماندەدا بڕیاری وەزارەتی ناوخۆی ژمارە (٢١٣٦)ی رۆژی ١٩٩٩/٩/٢١ کەتایبەتە بەعەرەبکردنی خوێندنگاکانی پارێزگا، جێبەجێ بکرێ.
دووەم: ئاگادارکردنەوەی لیژنەی چاودێری ناوخۆ لەپارێزگا بەپابەندکردنی هەموو خاوەن شوێنە بازرگانیو پیشەسازییەکان بەگۆڕینی ناوو ناونیشانە تۆمارکراوو نووسراوەکانی شوێنەکانیان کە بەزمانی غەیری عەرەبی نووسراون وەك کوردیو تورکمانی، کەهەموو شوێنەکانی وەك (قاوەخانە، کەمالیات، مۆبیلیات، گازینۆ، گەرماو، مزگەوت، تەکیە، گۆڕستان، مەرقەد، کۆڵان، شەقام، شوێنەوار، سالۆنەکانی تاشینو رازاندنەوەو جوانکاری، شوێنەکانی گەمەو رابواردنو گوزەراندنو وەرزش..تاد)و گۆڕینیان بۆ ناوو ناونیشانی عەرەبی کەئاکاری شۆڕشگێڕانەی حزبی ناسراویان پێوەبێ".
ئاخۆ عیراق بەدرێژایی بوونی وەك مەملەکەتێك لەم جۆرە پێشێلکارییە بەدئەخلاقییەو رەگەزپەرستانەی

تەنانەت دەرهەق بەناوی مزگەوتو تەکیەکان، ناوی گۆرستانو مەرقەدەکان بەخۆوە بینیوە؟ مەگەر رەگەزپەرستییەکی لەم رەگەزپەرستییە سەدامییەو دڕندانەیە نەگریسترو دڕندانەتر هەیە؟ مەگەر یەکێتی عیراقی بەم چیمەنە بنیات دەنرێ؟ یان بەم کردەوە رەگەزپەرستانەیەی کە لەکۆنەپەرستی و دیکتاتۆریەت نوقم بووە، دەروخێندرێو تێكو پێك دەشکێندرێ؟ سەرنج بدەن مەسەلەکە شاری کەرکوك تێدەپەڕێنێو هەموو پارێزگاکەی گرتووەتەوە، مەگەر ئەوە بێبەشکردنی خەڵك نییە لەسادەترین مافەکانی هاووڵاتیبوون؟ مەگەر ئەوە سووکایەتیکردن نییە دەرهەق بەمافی مرۆڤ لەهەڵبژاردنی ناوێك بۆ دوکانەکەی؟ دواتر مەگەر ئەوە سووکایەتیکردن نییە بەناوی مزگەوتو تەکیە، کەمزگەوتی وا هەیە لەکەرکوك سەدان ساڵەو لەو سەردەمەوە هەیە کە کەرکوك مەرکەزی ویلایەتی شارەزوور بووەو هیچ پەیوەندییەکی بەویلایەتی بەغداوە نەبوو، جگە لەئاڵای هاوبەشی عوسمانی.

پاشان بەڕێزان سەرنجی بڕیارەکەی سەدام حسێن بدەن وەك سەرۆکی بەناو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کە لە ٧/٢/٢٠٠٠ دەرچووە کە ئەمەیە:

یەکەم: بەڕێوەبەری کۆمپانیای نەوتی باکوور سەرپشك دەکرێ، یان ئەوەی ئەو سەرپشکی دەکاتو دەسەڵاتی دەداتێ تا رۆڵەکانی کەمینە نەتەوەییەکانی

غــــەیرە عـــەرەب (كــــوردو توركمــــان) بـــەگوێرەی پێداویستییەكانی بارودۆخی ئەمنی خانەنشین بكات.
دووەم: ئەم بڕگەیـەی سـەرەوە ئەوانـەش دەگرێتـەوە كـە لەبـەر رۆشـنایی رێنماییـە مەركەزیـەكان نەتـەوەی خۆیان گۆڕیوە.
با لەم بڕیارە قەرەقوشییە وردبینەوە كەدەریدەخات:
١-"ســەرۆكی بــەڕێز قــائیدی ئوممــەی عــەرەبی" تەنانـەت زمـانی عـەرەبیش نازانـێ و جیـاوازی لـەنێوان نـێرو مێشـدا ناكـات و لـەجیاتی ئـەوەی بنووسـێ (لمــا تســتوجبه الظــروف) دەنووسـێ (لمــا یســتوجبه الظــروف) لەجیاتی ئەوەش بڵێ (تشمل) دەنووسێ (یشمل)... بـەم جۆرە هیچ بڕگەیەك نییـە هەڵەیـەكی رێزمانـەوانی تێـدا نەبێت.
٢-فــەرماندەدا تەنانــەت ئەوانــەش دەربكرێــن كــە كــراون بەعــەرەب، كــەدیارە دەزانــێ بەعــەرەبكردنێكی بەزۆرو رووكەشە.
٣-هاووڵاتیان تەنیا لەبەر ئەوەی كورد یا توركمـانن دەردەكرێن و بەس بێ ئەوەی هۆكارێكی دیكە هەبێت.
مەگــەر دەشــێ وەحشــێكی دیكتــاتۆری وا ببێتــە ســـەرۆكی عـــیراقی عـــەرەب و كـــوردو توركمـــان و كلدۆئاشـــوور؟ بۆیـــە دەبـــێ بـــەگوێرەی بیروبـــاوەڕە عەفلەقییـە فاشیســتانەكەی پاكتـاوكردنی نـەژادی وەك ئەركێكی حزبی داسەپاو بەسەریدا ئەنجام بدات.

لەبەر ئەوە لەسەر هەموو ئەوانە پێویستە کە بۆ یەکێتی نیشتمانیی عیراقی پەرۆشن دژی پاکتاوکردنی نەژادیو سڕینەوەی شوێنەوارەکانی هەر لەڕاگوێزانەوە بگرە تا بەعەرەبکردنو بەزۆر نیشتەجێکردن لەپارێزگای کەرکوك تێبکۆشن بۆ ئەوەی هاووڵاتییەکانی تورکمانو کوردو کلدۆئاشوورو عەرەب بەئاشتیو ئارامییو برایەتی بژینو هەموویان چێژ لەمافەکانی هاووڵاتیبوونی یەکسان وەرگرنو هەر هەمووشیان بەشداری لەهەڵسووڕاندنی ئیدارەی پارێزگاکە بکەنو پێشیبخەنو گەشەی پێبدەن.

ئێمە دەمانەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە داکۆکیکردنی ئێمە بەتەنیا وابەستە نییە بەداکۆکیکردنێکی ڕەواو عادیلانە لەکوردی کەرکوك، بەڵکو لەپێشدا داکۆکیکردنە لەتورکمانی کەرکوكو کلدۆئاشوورییەکانی، کەدووچاری توندترین زوڵم بوونەوە بەنکوڵیکردن لەنەتەوەکەشیانەوە، دواتر داکۆکیکردنەکەمان داکۆکیکردنە لەهەموو ڕاگوێزراوەکانو زیانلێکەوتووەکان بەچاوپۆشی لەنەتەوەو مەزهەبیان.

لەتەك هەقانیەت دان بەهەق ئێمە بۆ یەکێتی نیشتمانیی عیراقی بەپەرۆشینو دەمانەوێ مەترسییەکانی لێ دوورخەینەوەو بیپارێزین، لەوانە مەترسییەکانی سیاسەتی پاکتاوکردنی نەژادی کە لەتەك ئەوانەی باسمانکردن دەبێتە مایەی بەرپاکردنی

دوژمنکاری‌و رق‌و کینە هەڵایساندن لەنێوان کوردو عەرەبی شیعە لەلایەك‌و تورکمان‌و داگیرکەرانی خاکەکەیان لەلایەکی دیکەوە، بەم جۆرە دەبێتە مایەی هەڵگیرساندنی فیتنەو دوژمنکاری‌و تەنانەت شەڕی ناوخۆش لەنێوان عەرەب‌و کوردو تورکمان‌و کلدۆئاشووری، بەتایبەتیش کەمەترسییەکانی ئەو لیژنەیەی بۆ وەرگرتنەوەی ویلایەتی موسڵ لەعیراق پێکهاتووەو چەندین ساڵە لەسویسراو ئەوروپا کاردەکات بۆ ئەوەی کێشەی ویلایەتی موسڵ لەمەحفەلە دەولییەکان‌و بەتایبەتیش لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا بوروژێنێ.

## لەناوبردنی پاکتاوکردنی نەژادی

## نەك پەیڕەوکردنی پاکتاوکردنی نەژادی لەکەرکوك

شارو پارێزگای کەرکوك ڕووبەڕووی سیاسەتی پاکتاوکردنی نەژادی بۆوە، ئەویش بەپێی پلانێکی نەگریس کە صەدام حسێن بۆ وەدیهێنانی چەندین مەبەست پەیڕەوی کرد:

١-دەرکردنی کوردو تورکمان‌و ئاشوری لەزێدی باب‌و باپیرانیان.

٢-نیشتەجێکردنی عەرەب وەك (مستەوتین) نیشتەجێ کراو نەك وەك هاوولاتی لەکەرکوك‌و دەوروبەری، ئەویش بەڕێگەی ئارەزووپێ‌کردن‌و هەڕەشەوە.

٣-نیشتەجێ کردنی عەرەبی شیعە لەشارەکە بەمەبەستی بەرپاکردنی فیتنە لەنێوان کوردو برا عەرەبە شیعەکانیان‌و تێکدانی ئەو هاوپەیمانێتییە ستراتیژییەی نێوانیان، هەروەها بەرپاکردنی ناکۆکی لەنێوان سوننەی (کوردو عەرەب‌و تورکمان)‌و هاوردە شیعەکان، هاوردنی ئەو ژمارە زۆرەش هەڕەشە لەشاری کەرکوك دەکات لەشارێکی سوننیەوە بگۆڕدرێ بەشارێکی شیعی.

لەنامیلکەیەکدا گەلێ بڕیاری ناڕەوا لەلایەن دیکتاتۆرو دامودەزگا داپلۆسێنەرەکەی دەربارەی

دەرکردنی کوردو تورکمانو دەستبەسەرداگرتنی زەویوزاریان دەرچووە بەمەبەستی وەدیهێنانی ئەم سیاسەتە نەفرەتلێکراوە.

نامیلکەکە مامۆستا تاریق جامباز بەناونیشانی (گۆڕینی نەتەوە)ی کوردو تورکمان لەکەرکوك بلاوی کردۆتەوە.

راگوێزانو دەست بەسەر ماڵو موڵکدا گرتن بەتەنیا پەیوەست نەبووە بەپارێزگای کەرکوك، بەڵکو گەلێ ناوچەی وەك خانەقینو مەندەلیو بەدرەو شێخانو ژەنگارو مەخمورو شوێنی دیکەشی گرتەوە.

راگوێزانیش هەر بەتەنیا کوردستانی نەگرتەوە، بەڵکو دیکتاتۆری بەغدا دەرهەق بەسەدان هەزار برا کوردە فەیلیەکانو عەرەبی شیعەش بەکاری هێنان، کە بەتومەتی بنەچەی ئیرانییان تاوانبار کرابوون. هەموو ئەو هاووڵاتیە عیراقییانە دووچاری سیاسەتی راگوێزانو موڵكو ماڵ زەوتکردنو تالانکرانی سامانی گوازراوەو پارەی بلۆککراوی بانکەکان بوونەوە.

نۆیەم:

ئۆپۆزسیۆنی عیراقی چارەسەری ئەم سیاسەتە تاوانکارانەی کردو ئەم بڕیارانەی دەرهەق دەرکردن:

دەربارەی راگوێزانو پاکتاوکردنی نەژادیو گۆڕینی واقعیی نەتەوەیی:

(کۆنگرە راگوێزانی بەزۆرو پاکتاوکردنی نەژادیو بەکارهێنانی چەکی کیمیاویو گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەییو ئەو گۆڕینانەی لەواقیعی نەتەوەیی ناوچەکانی کەرکوكو خانەقینو ژەنگارو شێخانو زمارو مەندەلیو شوێنەکانی دی کران، ئیدانە دەکاتو داواکارە شوێنەوارەکانیان بسڕێتەوە ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

أ-گەڕانەوەی راگوێزراوەکان بۆ جێگاو رێگای خۆیانو گێڕانەوەی ماڵو موڵکیانو قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی لێیان کەوتوە.

ب-گێڕانەوەی ئەوانەی دەسەلاّت هێنابوونیو لەو ناوچانەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا نیشتەجێ کرابوون بۆ شوێنەکانی پێشتریان.

ت-گەڕانەوەی کوردە فەیلیەکانو هەموو ئەو عیراقییانەی بەبیانووی بنەچەی ئێرانی بۆ دەرەوەی وڵات راگوێزرابوون، بۆ عیراق بەچاوپۆشی لەبنەچەیان، کە رژێم بەبێ هیچ رووڵێکی حەق لەهاوولاّتیبوونی عیراقی بێبەشی کردنو دەستەبەرکردنی وەرگرتنی رەگەزنامەی عیراقیو گێڕانەوەی ماڵو موڵکیانو قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی لێیان کەوتووەو ئاشکراکردنی چارەنووسی ئەو فەیلیە گیراوانەی کە لەنیسانی ١٩٨٠-ەوە بەندکراون.

پ-لابردنی هەموو ئەو کردەوە ئیداریانەی رژێم هەر لەساڵی -١٩٦٨وە کەبەمەبەستی گۆڕینی واقیعی دیموگرافیی کوردستانی عیراق ئەنجامی داون.

هەروەها ئەنجومەنی حوکمی عیراقیش بڕیاریدا وەزارەتێکی تایبەت بەڕاگوێزراوان و زیان لێکەوتووەکان پێکبێنێ بۆ ئەوەی چارەسەری کارەساتە مرۆییەکان بکات.

ئاساییشە مرۆڤی عیراقی کە لەوڵاتی خۆی یا گوندی خۆی دەرکراوەو ماڵ و مۆڵك و زەوی و خانووی زەوت کراوە، ئاساییە هەرچی لێی زەوت کراوە لەگەڵ قەرەبووکردنەوەیەکی عادیلانە بۆ ئەو زیانانەی لێی کەوتوون بۆی بگەڕێنرێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی کاروبارەکان وەك پێشوویان لێبێتەوەو بۆ ئەوەش هەقانیەتی هەق دەرکەوێ و بارودۆخەکە ئاسایی بکرێتەوە. لەبەر ئەوە ناکرێ گەڕاندنەوەی راگوێزراوو دەرکراوەکان بۆ شوێنی نیشتەجێبوونیان بۆ شارو گوندەکانی خۆیان بەپاکتاوکردنی رەگەزی دابندرێ، وەك چۆن ناکرێ گێڕانەوەی نیشتەجێکراوەکانیش بۆ شوێنی پێشوویان وا دابندرێ چونکە گەڕانەوەی راگوێزراوەکان و دەرکراوەکان بۆ شوێنی پێشوویان، خۆی لەخۆیدا نەهێشتنی پاکتاوکردنی نەژادی و شوێنەوارەکانیەتی و ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکەیە کە وەك جارانی لێبکرێتەوە، بەر لەوەی دیکتاتۆریەت بەکردەوەی رەگەزپەرستانە بیگۆڕێ.

گێڕانەوەی نیشتەجێکراوە زەوتکەرەکانیش خۆی لەخۆیدا کۆتایی هێنانە بە شوێنەوارەکانی پاکتاوکردنی نەژادی. عیراقی نوێش، عیراقی دیموکراسیی بە ئومێدخوازراو ناتوانێ لەبەردەم رەشەباو پیلانە ناوخۆو دەرەکییەکان خۆی راگرێ ئەگەر لەسەر بنەمای هەقانیەتی حەق و سڕینەوەی شوێنەوارەکانی چەوسانەوەی تایەفیو نەتەوەیی و ئەو پاکتاوکردنی رەگەزییە نەبێ کەلێیان وەپاشکەوتووەو لەسەر بنەمای فیدرالیەت و مافی هاوولاتیبوونی یەکسان نەبێ، ئەوانەش کەدژایەتی راستکردنەوەی هەڵەکان و ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکان دەکەن، دژایەتی ئەم عیراقە نوێیە بەئاواتخوازراوە دەکەن و بیانەوێ و نەیانەوێ پشتگیری لەسیاسەتی دیکتاتۆریەتی گۆڕین دەکەن، ئەوەی کە عیراقی تووشی کارەسات وماڵوێرانی کرد.

بەلام ئەوانەی لەنێو ئۆپۆزسیۆنی عیراقیدان و لایەنگری بارودۆخەکان ناکەن ئەوا ئەم هەڵوێستەیان پاشگەزبوونەوەیە لەپابەندبوونیان بە گفت و بەڵێن و هاوپەیمانێتیەکانیان؛ جا بۆ ئەوەی وەبیریان بێنینەوە- ئێ بەڵکو وەبیرهێنانەوە بۆ ئیماندارانی سوودبەخش بێت- پێشتر دەقی بڕیارەکانی کۆنگرەی لەندەنی ئۆپۆزسیۆنی عیراقیمان روونکردەوەو بلاومانکردەوە.

بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو رەگەزپەرستانەی داکۆکی لەسیاسەتی صەدامی دیکتاتۆرو کردەوە

ڕەگەزپەرستانەکەی دەکەن و بانگەشەی ئەوە دەکەن ئاساییکردنەوە، پاکتاوکردنی نەژادییە، کەچی لەهەقیقەتدا نەهێشتنی شوێنەوارەکانی پاکتاوکردنی نەژادییە، پێویست بوو ئەوانە ڕوونبکەینەوە.

## لیستی چۆنیەتی جێبەجێکردنی سیاسەتی پاکتاوکردنی نەژادی

| ژ | ساڵ | ژمارەی نێرینە | ژمارەی مێینە | کۆی کەسەکان | ژمارەی خێزانەکان |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ | ١٩٨١ | ١٥٣٠٣ | ١٤٧٠٣ | ٣٠٠٠٦ | ٤٥٩٠ |
| ٢ | ١٩٨٢ | ٢١٠٣ | ٢١١٤ | ٤٢١٧ | ٦٥٨ |
| ٣ | ١٩٨٣ | ٩٨٢ | ٩٦٠ | ١٩٤٢ | ٢٧٣ |
| ٤ | ١٩٨٤ | ١٨٤٩ | ١٧٧٣ | ٢٦٢٢ | ٥٢٢ |
| ٥ | ١٩٨٥ | ٨٥٤ | ٨٥١ | ١٧٠٥ | ٢٥٨ |
| ٦ | ١٩٨٦ | ٦٤٧٤ | ٦٢١٩ | ١٢٦٩٣ | ١٩٧٤ |
| ٧ | ١٩٨٧ | ١١٨٧٩ | ١١٣٢٣ | ٢٣٢٠٢ | ٤٩٠٦ |
| ٨ | ١٩٨٨ | ١٢٤٧٣ | ١٢٠٦٥ | ٢٤٥٣٨ | ٥٣٤٦ |
| ٩ | ١٩٨٩ | ١٤٥٦٠ | ١٣٩٣٧ | ٢٨٤٩٧ | ٥٨٤٦ |
| ١٠ | ١٩٩٠ | ١١٨٢٩ | ١١٢٧٣ | ٢٣١٠٢ | ٥٦٩١ |
| ١١ | ١٩٩١ | ١٠٤٢ | ١٠٣٢ | ٢٠٧٤ | ٤١٥ |

| ١٢ | ١٩٩٢ | ٩٢٢ | ٨٥٥ | ١٧٧٧ | ٢٨٨ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٣ | ١٩٩٣ | ٣٢٧ | ٣٠٠ | ٦٢٧ | ١٢٢ |
| ١٤ | ١٩٩٤ | ٢٢٩ | ٢٥٥ | ٤٨٤ | ٦٢ |
| ١٥ | ١٩٩٥ | ٢٨٣ | ١٧٢ | ٣٥٥ | ٢٨ |
| ١٦ | ١٩٩٦ | ٧٣٠ | ٧٣٣ | ١٤٦٣ | ١٨٨ |
| ١٧ | ١٩٩٧ | ١٦١٦ | ١٩٨٠ | ٢٥٩٦ | ٥٥١ |
| ١٨ | ١٩٩٨ | ٤٨٩١ | ٥١١٣ | ١٠٠٠٤ | ١٦٦٦ |
| ١٩ | ١٩٩٩ | ١٢٤٤ | ١١٠٩ | ٢٣٥٣ | ٤٤٨ |
| ٢٠ | ٢٠٠٠ | ١١٦٤ | ١١١٧ | ٢٢٨١ | ٢٧٤ |
| ٢١ | ٢٠٠١ | ٢٥٤٢ | ٢٤٧٠ | ٥٠١٢ | ١٠٠٦ |
| ٢٢ | ٢٠٠٢ | ٤٧٥٠ | ٤٨٥٧ | ٩٦٠٧ | ١٦٠٠ |
| کۆی گشتی | | | | ١٩٣١٥٧ | ٣٦٩١٢ |
| | | | | ٥,٢٣ کەس/ خێزان | |

## ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکانی کەرکوك پێداویستیەکی نیشتمانییە

ئەگەر مەسەلەی دیاریکردنی چارەنووسی کەرکوك لەپێکهاتەی فیدرالیی عیراقیدا هی ئەوەبێ تا کامڵ بوونی مەرجە گونجاوەکان دوا بخرێ، ئەوا ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکانی کەرکوك مەسەلەیەکە نەك هەر خۆ گونجاندنو پشتگوێ خستن قەبوڵ ناکات بەڵکو پێداویستیەکی نیشتمانیی پێویستیشە لەبەرچی..؟

یەکەم- لەرووی مرڤایەتیەوە:

بۆ چارەسەرکردنی تراژیدیای دەیان هەزار خێزانی کورد تورکمانی لەخاکی خۆیان راگوێزراو کەدەخوازن بگەڕینەوە گوندو لادێو شارەکەیان وەك ئەم دوو نموونەیە:

١-زیاتر لەهەزار خێزانی تورکمانی شیعە لەناوچەی شیعەکە دەخوازن بگەڕینەوە بۆ گوندەکایانو هیچ پێداویستیەکی نیشتەجێبوونی تازەی ئەو تۆیان نییە، پێویستە هاوپەیمانانو حکومەتی ناوەندو حکومەتی هەرێم یارمەتییان بدەن بۆ ئەوەی گوندەکانیان دروست بکەنەوە تا بتوانن زەویو زارەکانیان بەناوبێنن.

٢-هەزاران خێزانی کورد کە بەم زستانە تەڕو تووشەدا لەژێر چادرا دەژینو خراپترین گوزەرانیان هەیە دەبێ لەشوێنو ناوچەکانی خۆیاندا نیشتەجێ بکرێنەوە، ئەویش بەدەرکردنی ئەوانەی شوێنەکانیان زەوتکردوونو گێڕانەوەیان بۆ ئەو شوێنانەی لێیەوە هاتوون.

دووەم- لەڕووی دیموکراسیەوە:

١-ناکرێ ئەو سیاسەتی پاکتاوکردنی نەژادییەی دیکتاتۆریەتی سەدامی دژی سەدان هەزار کوردو تورکمان لەکەرکوك پەیڕەوی کرد قەبوڵ بکرێ، بەڵکو دەبێ شوێنەوارەکەی لەناو ببردرێو کاریگەریەکانی بسڕێنەوە.

٢-ناکرێ هزری هەڵبژاردنێکی ئازاد بکرێ کە دەربڕی رای جەماوەری کەرکوك بێ بەبێئەوەی بارودۆخەکان ئاسایی بکرێنەوەو کۆتایی بەشوێنەوارەکانی پاکتاوکردنی نەژادیی بهێنەرێ کە دژی کوردو تورکمان پەیڕەو کرابوو. بۆیی دیموکراسیەت وادەخوازێ بەلە نەهێشتنی شوێنەوارەکانی پاکتاوکردنی نەژادیو ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکانی کەرکوك

سێیەم: لەڕووی یاساییەوە:

ئەو کاتەی کە بڕیارەکانی بەناو ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی هەڵوەسێندراینەوە، مانای ئەوەیە کە شوێنەوارەکانی پاکتاوکردنی نەژادی

بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بۆ هەمیشە ناهێلدرێ، ئەو شوێنەوارانەی کە لەئەنجامی جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە قەرەقوشیە زاکانەیە درابوون.

چوارەم: لەپێناو هەقانیەتی هەقدا:

زولێکی زۆر لەکوردو تورکمان کراوەو هەزاران ماڵیان و زەوی زارێکی فراوانیان زەوت کراون و موڵك و ماڵیان بردراون،بۆیی بۆ گێڕانەوەی ئەو هەقە دەبێ ئەو بارودۆخە شازە کۆتایی پێ بهێندرێ و زەوی زارو خانووەکان بۆ خاوەنە شەرعیەکانیان بگێڕدرێنەوە.

پێنجەم- کۆتایی هێنان بەجیاوازیی نەژادی:

دیکتاتۆریەت یاسایەکی زاڵمانەی دەرهەق بەقەدەغەکردنی کوردو عەرەب و تورکمان سەبارەت بە دروستکردنەوەی خانووە روخێندراوەکان یان دروست کردنی خانووی تازە دەرکرد لەکەرکوك و کۆت و پێوەندێکی توندی بەسەر خەڵکی کوردو تورکمان سەپاند لەشارەکەدا. جا بۆ ئەوەی جیاوازیی نەژادی نەهێلدرێ و مەبدەئی یەکسانی لەنێو هاوولاتیاندا جێبەجێ بکرێ دەبێ ئەو بڕیارانە هەڵبوەشێندرێنەوە.

شەشەم- بۆ تێگەیاندنی خەڵك بەکردەوە کە:

هاوپەیمانان عیراقیان لەو دیکتاتۆریەت رزگارکردووەو رزگارکردنەکەش سەرتاسەریی و ئەوەش مانای ئەوەیە کەرژێمی دیکتاتۆریەت و شوێنەوارەکەشی لەناوچووە نەك هەر بەتەنیا عیراق لەدیکتاتۆریەتی دڕندە رزگارکراووە.

حەوتەم- بۆ بەدەنگەوە چوونی بانگەوازو ئارەزووی دەیان هەزار خێزانی کوردو تورکمان کە تاوانی دەرهەق کردبوون، ئەم بەدەنگەوە چوونەی ئەو سەدان هەزارکەسەش خۆی لەخۆیدا بەتەنگەوەچوونو تێک گەیشتنو یەکبوونە لەگەڵ ئەواندا بۆ خزمەتکردنی عیراق.

هەشتەم- بۆ هێنانەدی ئاسایشو ئارامیو نەهێشتنی تیرۆژی کۆێرانە:

ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکان واتە گێڕانەوەی هاوردەکان- کە زۆر لەوانە لەدیکتاتۆریەت سوودمەندبوونو زۆریشیان تا ئێستا سەر بەسەدام حسین-ن بۆ شوێنی راستەقینەی خۆیان کە بەمەش کەرکوك- پارێزگاو شار- لە مۆڵگەی تیرۆری رەشو حەشارگەو پەناگەی تیرۆریستە ناوخۆکان ئەوانەش کە نێردراونو هاتوونەتە ناوچەکە رزگاری دەبێ بەمەش هاوولاتیان لەتیرۆری تاوانکار رزگاریان دەبێتو ئاسایش بۆ هێندی هاوپەیمانان دابین دەکرێو سەربازو کەسەکانیان لەتیرۆرستان رزگاریان دەبێ.

نۆیەم:

بۆ کار ئاسانیی ئاوەدانکردنەوەو گەشەپێدانی ئابووریو فەرهەنگی دوای ئەوەی هاوولاتیەکان دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیانو سامانی خۆیان دەخەنە گەڕو دوای ئەوەش کە ئارامی دێتە دی، ئەوا سەرمایەی نیشتمانی (کوردستانیو عیراقی)و سیانی

بـــۆ بەرهەمـــهێنان روو دەكەنـــە كـــەركوك‌و بـــازاڕ دەگەشێتەوەو ئابووریش پەرەدەستێنێ.

دەیەم: بۆ جێبەجێكردنی شەریعەتی ئیسلامی كە خوێنـی براكـەی‌و مـاڵی براكـەی‌و زەویـی براكـەی لەموسوڵمانان سەردام كردووە، ئەوەی كە ئەنجامدراوە پێچەوانـەی شـەریعەتی ئیسلامیەو ئەوانـەی هـاتوون خواردنەكانیان لێ حەرام‌و نوێژەكانیان لەسەر خاكێكی زەوتكراودا بەتاڵە.

یازدەیەم:

وەك رێزگرتنێـك لـەمافی مـرۆڤ‌و جاڕدانی جیـهانی مـافی مـرۆڤ كـە حكومـەتی عـیراقی مـۆری كـردووە كەراگوێزان‌و دەربەردەری‌و گۆڕینی ئاكارە نەتـەوەیی‌و مەزهەبیەكان قەدەغەدەكات.

ئەوانـــە ئـــەو هۆكـــارە پێویســـتانەن بـــۆ ئاســـایی كردنـەوەی وەكـاتی بارودۆخـەكانی كـەركوك، جـا ئـەوە ماوە بزانین ئاسایی كردنەوە چۆنە.

ئێمـە پێمـان وایـە ئاسـاییكردنەوە جێبـەجێكردنی بڕیارەكانی ئۆپزیسۆنی عیراقیەكە ئەمە دەگەیەنێ:

١-سەر لەنوێ یەكخستنەوەی كەركوك‌و گێڕانـەوەی بـۆ سـەردەمی بـەر لەدەسـتكردنی بـەعس بـەگۆڕینی ناوەكـەی‌و پارچەكردنی‌و توزخورمـاتوو بخرێتـە سـەر تكریت‌و كفری بۆ سەر بەعتوبەو كەلارو چەمچەماڵ بۆ سەر سلێمانی.

٢-گێڕانەوەی ڕاگوێزراوەکان‌و ئاوارەکان بۆ شوێنی پێشینەی خۆیان‌و گێڕانەوەی هاوردە نیشتەجێکراوەکان بۆ ناوچەکانی پێشووی خۆیان لەگەڵ پێشکەشکردنی کۆمەکی ماددی بۆیان بۆ ئەوەی بتوانن دەست بەژیانێکی سەربەست‌و سەرفراز بکەن‌و ژیانێکی ئاسوودە ببەن سەرو بەحەڵاڵی بخۆن‌و نوێژەکانیان‌و سرووتە ئاینیەکانی دیکەیان پەیڕەوبکەن.

لەقازانج بەدەرنیە ئەگەر لێدەدا دەقی بڕیارەکانی کۆنگرەی لەندەن سەبارەت بەم بابەتە بخەینەروو:

نۆیەم: دەربارەی ڕاگوێزان‌و پاکتاتاوکردنی نەژادی‌و گۆڕینی واقیعی نەتەوەیی، کۆنگرە داوای لابردنی شوێنەوارەکانی ڕاگوێزانی بەزۆرو پاکتاوکردنی نەژادی‌و بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و ئەو گۆڕینانەی بەسەر واقیعی نەتەوەیی ناوچەکانی کەرکوك‌و مەخمور خانەقین‌و ژەنگارو شێخان‌و زمارو مەندەلی‌و شوێنەکانی دیکە هێندراون دەکات.

دەکات ئەویش بەپەیڕەوکردنی ئەم کردەوانەی خوارەوە:

أ-گۆڕانەوەی ڕاگوێزراوەکان بۆ شوێنی خۆیان‌و گێڕانەوەی ماڵ‌و موڵکەکانیان‌و قەرەبوو کردنەوەی ئەو زیانانەی لێیان کەوتوە.

ب-گێڕانەوەی ئەو هاوردانە دەسەڵات لەو ناوچانەدا نیشتەجێی کردبوون بۆ شوێنی پێشوویان.

ت-گەڕانەوەی کوردە فەیلییەکانو هەموو ئەو عیراقیانەی بەبیانووی بنەچەی ئێرانییان لەعیراق دەرکران بۆ عیراق بەچاو پۆشی لەبنەچەیان کە بەناهەق مافی هاوولاتیبوونیان لێ سەندرایەوەو گێڕانەوەی ماڵو موڵکیانو قەرەبوو کردنەوەی ئەو زیانانەی لێیان کەوتبوو ئاشکراکردنی چارەنووسی ئەو فەیلیە گیرافانەی لەنیسانی ۱۹۸۰وەرگیرابوون.

س-هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو کردەوە ئیداریانەی رژێم لەساڵی ۱۹۸۰وە بەئامانجی گۆڕینی واقیعی دیموگرافی کوردستانی عیراق ئەنجامی داون.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئێمە پشتگیریی جێبەجێکردنی ئاسایی‌کردنەوە دەکەین بەشێوەیەکی رێکوپێکو بەرنامە رێژو خێراییەکی پێویست.

هەروەها پشتگیریی ئەوەش دەکەین کە ئەو برا هاوولاتیانەمان تێبگەیەنین کە دیکتاتۆریەتی بۆگەن ناچاریکردبوونو دەیویست بەهۆیەوە ئاگری فیتنە لەنێوان هاوولاتیانی کوردو تورکمان لەلایەکو برا عەرەبەکانیان لەلایەکی دیکەوە هەڵبگرسێنێ هەروەها هەڵگیرساندنی فیتنەیەکی تایەفەگەری ئەویش بەگواستنەوەی عەرەبی شیعە بۆ ئەو ناوچەیەی کە بەردەوام ناوچەی سوننە بووە، بەم جۆرە دیکتاتۆریەت سیاسەتێکی نەفرەت لێکراوی پەیڕەوکرد، کە لەبەعەرەبەکردنو بەشیعەکردن خۆی نواند، ئەمە وێڕای

ئـەوەش کەدوژمنایەتیـەکی تونـدی لەگـەڵ بـرا شـیعە عەرەبو تورکمانەکاندا هەبوو.

**مافی نیشتەجێبوونو زوڵمی نیشتەجیکردن:**

لەوانەیـە هێندێـك بڵێـن هاوردەنیشـتەجێ کراوەکـان هاوولاّتی عیراقنو هاوولاّتیـانی عیراقیش مـافی ئەوەیان هەیە لەهەر کوێیەك بیانەوێ نیشتەجێبن.

بـۆ رەتکردنـەوەی ئـەم قسـەیە کەقسـەیەکی هەقـەو ناهـەقیی پێدەکـرێ دەڵێـن ئـەوە نیشـتەجێکردنە نـەك نیشتەجێبوون. ئەمە نیشتەجێ کردنێکی بەزۆر داریەو نیشـتەجێ کردنێکـی رەگـەز پەرسـتانەی تایفیـە بـۆ گۆڕینی دیموگرافیی ناوچەکەو مەزهەبەکەی. بەم جۆرە نیشتەجێ بوونێکی ئاسایی نییەو پەیڕەوکردنی مـافی هاوولاّتی نییە لەنیشتەجێ کردنێکی رەگەز پەرستانەی تایفیە بۆ گۆڕینی دیموگرافیی ناوچەکەو مەزهەبەکەی.

بـەم جـۆرە نیشـتەجێبوونێکی ئاسـایی نییـەو پەیڕەوکردنی مـافی هـاوولاّتی نییـە لەنیشـتەجێ بـوون بـەڵکو پرۆسـەیەکە بـۆ پـەیڕەوکردنی سیاسـەتێك کـە فیتنـەو رقو کینـە لـەنێوان هاوولاّتیـانی کوردو تورکمـان دەنێتەوە لەلایەك، لەنێوان شیعەو سوننەدا.

بـەم جـۆرە ئـەم بـەزۆر نیشـتەجێکردنە یـەکێتی نیشـتمانیی عـیراقی هەڵدەتـەکێنێ. دواتـر ئـەم نیشـتەجێکردنە لەسـەر خـاکێکی بـەتاڵ نییـە، بـەڵکو لەسەر لاشەی خاوەنی خاكو ناوچە مێژووییەکەیە کـە

ئەمە خۆی لەخۆیدا زەوتەکردنی مافی هەوولاتیانو زەوتکردنی خاکە لەخاوەنە شەرعیەکەی.

بادوو نموونە وەرگرین.

١-سامەڕا لای شیعەکان شارێکی پیرۆزە، بەلام زۆربەی سوننەیە، دەبێ هەلوێستی خەلکی سامەڕا چی بێ بەتایبەتیو عەرەبی سوننەش بەگشتی ئەگەر حکومەتی عیراقی دوو سەد هەزار عەرەبی شیعە لەسامەڕا نیشتەجێ بکات؟

ئاخۆ پێشوازییان لێدەکەن..؟ یان قەبوڵیان ناکەن.؟

٢-لەسەردەمێکدا زۆربەی دانیشتوانی (حەی) کوردی فەیلی بوون، ئاخۆ هەلوێستی عەرەبی شیعە چی دەبێ ئەگەر حکومەت سەد هەزار کوردی سوننە لەسەر لاشەی هاوولاتیانی (حەی) نیشتەجێ بکاتو بەبەشێك لەکوردستانی عیراقی دابنێ؟ ئایا ئەوەیان قەبووڵە..؟ کە بەقەد کەرکوكو توزخورماتووش گرنگ نییە..؟!

کەواتە ئێمە لەگەڵ مافی نیشتەجێبوونی هاوولاتیانی عیراقین لەهەر کوێیەك بیانەوێ بەلام دژی بەزۆر نیشتەجێ کردنین کە بەمەبەستی گۆڕینی واقیعی نەتەوەییو مەزهەبی بکرێ. ئێمە ئەوە دەڵێین چونکە بەکردەوە سیاسەتی گۆڕینی واقیعی نەتەوەییمان دەرهەق کراوەو هەر لەسەرەتای دامەزرانی دەوڵەتی عیراقیەوە بەدەست ئەم سیاسەتەوە دەناڵێنین

بەتایبەتیش پاش ئەوەی بەعسی فاشیست جڵەوی کاروبارەکانی لەعیراق گرتە دەست.

دەبێ ئەوەش بڵێین کەئێکە نامانەوێ بەتەنیا کوردە راگوێزراوەکان بگەڕێنەوە. بەڵکو تورکمانو ئاشووریو کلدانیە راگوێزراوەکانیش، ئێمە داوای ئاسایی کردنەوەیەکی راستەقینەدەکەین کە هەمووان بگرێتەوە، خەڵکو لادێو شاریش.

لەبەر رۆشنایی ئەوانەی باسکران، ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی کەرکوک پێداویستیەکی نیشتمانیی پێویستەو مەترسی ئەوە هەیە ئەگەر دوابخرێو دوابکەوێ ئەنجامەکەی رەچاو نەکراو دەبێ، لەبەر ئەوە ئێمە داواکارین تازووە دەست بەئاسایی کردنەوەی وەکاتی بارودۆخەکانی پارێزگای کەرکوک بکرێ.

## بەرژەوەندییە راستەقینەکانی نەتەوەی تورکمان لەکوێدایە..؟

-١-

نەتــەوەی تورکمــانیش وەك نەتــەوەکانی کــوردو کلدۆئاشــووری برایــان زوڵمێکــی زۆری لێکــراوە، گرنگترینیشـیان چەوسـانەوەی نەتەوەییـە کـە خـۆی لەڕەتکردنـەوەی بوونـیو ناچـارکردنی رۆڵـەکانی تـا بەعـەرەب یـان بەکورد خۆیان ناونووس بکەن، تەنانـەت شۆڤێنیەتی عەفلەقی لـەخۆی رادیـت کـە تـاریق عـەزیز لەپایتەختی تورکیا بڵێ: تورکمـان لـەعیراقدا نییـە، بـێ ئـەوەی کاردانەوەیــەکی کاریگــەری تورکیــش هــەبێ، تەنانـەت رۆژنامـەکانی تورکیـاش خۆیـان لێ گێـل کـردو چاویان لەو لێدووانە ئیستیفزازییە نووقاند.

لـەوڵاتدا.. جگـە لـەچیاکان پەناگەیـەك بـۆ تورکمانـە ئازادیخوازەکـان نـەبوو، بۆیـە بـرا کوردەکانیـان لـەپێش هەمووشــیانەوە براکانیــان لــە یــەکێتیی نیشــتمانیی کوردســتاندا باوەشــیان بــۆ کردنــەوەو هــەر شــتێکی هـەیانبووبێ لێیـان چاو نـەبوون، تەنانـەت بەرنامەیـەکی تورکمانیشـیان لـەڕادیۆی کوردسـتاندا بـۆ تـەرخانکرا، دوای راپــەڕینو ئــازادکردنی بەشــێکی گرنگــی کوردســتانی عـیراق یــەکێتیی نیشـتمانیی کوردســتان دەسـتوبردی کـرد لەپێشکەشـکردنی کۆمـەکی گونجـاو

بەچەك پێدان‌و ئاسانكاریی كردن بۆ برا توركمانەكان، ئەوەش ئەركێكی برایەتی دێرینی سەدان ساڵەی نێوان كوردو توركمان بوو. لەكاتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی كوردستانیشدا یەكێتی‌و پارتی وەك برا ئاشوورییەكان چەند كورسییەكیان دانێ كەزۆر زیاتر بوو لەرێژەی بوونی خۆیان، بەڵام شۆڤێنیەتی كوێرانەی سەركردایەتی بەرەی توركمانی بەشداریكردنی لەئەنجومەن‌و دواتریش لەوەزارەتەكانی هەرێم كەپلەی جێگری سەرۆك وەزیران‌و چەند وەزارەتێكیان دەدرایێ رەتكردەوە.

ئەوەی سەیروسەمەرەیە سەرۆكێكی بەرەی توركمانی كەپێشتر ئەندامی ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی كوردستان بوو (مجلس تشریعی) بەبیانووی بوونی ناوی كوردستان بەسەر ئەنجومەنەوە بەشداریكردنی رەتكردەوە، كەچی وێڕای بوونی ناوی كوردستان لەئەنجومەنی یاسادانانی سەدامیدا بۆ دوو خولی پەرلەمان ئەندامێتی قبووڵ كردبوو، سەركردایەتی بەرەی توركمانی بەردەوام بوو لەسەر رەتكردنەوەی ناوهێنانی كوردستان، ئەگەرچی لەسەردەمی رژێمی بەعسدا ناوی رەسمیی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بووەو وێڕای ئەوە كوردستان لەسەردەمی عوسمانیشدا بەكارهاتووە، لەوەش زیاتر لەسەرەتای سەردەمی خوالێخۆشبوو مستەفا كەمال پاشا ئەتاتورك دا لەسەر دیواری ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانیی

توركیدا رستەیەك نووسرابوو بەناوی (كردستان میللت وكیلی) واتە نائیبەكانی كوردستان.

ئاشكراشە كە لەكۆماری ئیسلامیدا ویلایەتێك ناوی (استان كردستان)ەو زانكۆیەكی لێیە بەناوی (دانشگای كردستان)و بلوارێكیش لەتارانی پایتەختدا ناوی (بزرگ راه كردستان)ە -شارێی كوردستان- تەنانەت فڕۆكەی سەرۆكایەتی ئێرانیش ناوی كوردستان-ی بەسەرەوەیە. لەڕاستیدا رەتكردنەوەی ناوی كوردستان و خۆ لێ گێلكردنی تاكە هۆكاری راستەقینە نەبوو لای بەرەی توركمانی تا بەشداریی لەئەنجومەنی نیشتمانی كوردستان و وەزارەتەكانی هەرێمی كوردستان نەكەن، بەڵكو فەرمانە توندەكانی دەرەوەی سنوورو شۆڤێنیەت و پابەندنەبوونیان بەبەرژەوەندییەكانی توركمان ئەم هەڵوێستە زیانبەخشەی بەسەر برا توركمانەكان و بەرژەوەندییەكانیاندا سەپاند، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا حكومەتی هەرێمی كوردستان بڕیاریدا لەهەولێرەوە بگرە تا دەگاتە كفری خوێندنگاو باخچەی منداڵان بەزمانی توركمانی بۆ برا توركمانەكان بكاتەوە جا لەهەر كوێیەك بن، ئەگەرچی بەژمارەش كەم بووبن، هەروەها رێگەی پەخشی رادیۆیی و دەركردنی گۆڤارو رۆژنامە بەزمانی توركمانی و تەنانەت میلیشیای چەكداریشی پێدان، بەمجۆرە واقیعەكان سەلماندیان كەبەرژەوەندی راستەقینەی نەتەوەی توركمان

لەکوردستانێکی فیدرالی دیموکراتیدایە نەك لەعیراقێکی دیکتاتۆری کە نەتەوەی تورکمانی تێدا کەوتبووە بەر شالاوی قڕکردنی سیاسیی و چەوسانەوەو بەزۆر بەعەرەبکردن.

سالی (١٩٧٧) لەبەلگەنامەیەکی رەسمیی عیراقیدا راگەیەندرابوو کە (٤٢٣٨٦) تورکمان لەپارێزگای کەرکوك نەتەوەی خۆیان کردووەتە عەرەب، ئەمە جگە لەبێبەشکردنی تورکمان لەخوێندنگاکان و جگە لەبێبەشکردنیان لەمافە سیاسیی و ئیدارییەکان و وەك هەر عیراقییەك بێبەشکردنیان لەسادەترین ماف و ئازادییە دیموکراتییەکان بەمافی هەلبژاردنی نوێنەریشیانەوە لەئەنجومەنەکانی ناوخۆو ناوەندا، هەرچی وەدەرنان و دوورخستنەوەش بوو برا تورکمانەکانیشی وەك برا کوردەکانیان گرتەوەو کەوتنە بەرشالاوی بەزۆر بەعەرەبکردن و بەشخوران لەکەرکوك، بۆ نموونە؛ لەمافی مولکداریی و خانوو دروستکردن تەنانەت ئەوەی کەدەولەت بۆ کردنەوەی شەقامێکی نوێش تێکی دەدات بێبەش کران.

هەموو ئەو زولم و زۆرانە لەبرا تورکمانەکان دەکرا بێ ئەوەی لەدەرەوە دەنگێك جگە لەدەنگی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی (عەرەبی کوردی) دیموکراتیی و نیشتمانیی و ئیسلامی بەرزبێتەوەو بەرگرییان لێ بکات.

## بەرژەوەندییە راستەقینەکانی
## نەتەوەی تورکمان لەکوێدایە

-٢-

### کێشەی کەرکوك

دەیان ساڵە کەرکوك بەزۆری زۆرداریی یان بەناچارکردن یان بەئارەزووپێکردن یانیش بەهەرەشە دووچاری سیاسەتی گۆڕینی دیموگرافی بۆتەوە.

خۆ ئەگەر شاڵاوی پاکتاوکردنی رەگەزیی بەپلەی یەك لەسەر کورد بووبێ ئەوا بەپلەی دوو لەسەر تورکمان بووە، ئەوەبوو تورکمان لەگوندو شارەکان بەخودی کەرکوکیشەوەو لەداقوق‌و خورماتوو ناحیەو لادێکانی دی راگوێزران، هەروەها یاسا ئیستیسنا شۆڤێنییەکانی وەك قەدەغەکردنی موڵکداری‌و بێبەشکردن لە خانوو دروستکردن‌و نیشتەجێبوون‌و دامەزراندن تورکمان‌و کوردی گرتەوەو ماوەی چل ساڵ دیکتاتۆریەت بەئەنقەست سی هەزار خێزانی عەرەبی شیعەی بۆ کەرکوك‌و دەوروبەری گواستەوە، ئامانجەکەش ئاشکرابوو کە بەزۆر بەعەرەبکردنی شاری کەرکوك بوو بەپلەی یەکەم‌و دووەمیشیان بۆ پاراستنی‌و گۆڕینی مۆرکی مەزهەبی لەسوننەوە بۆ

شیعە، ئەویش بەمەبەستێکی نەفرەتلێکراو کە بەرپاکردنی دوژمنداری بوو لەنێوان کوردو تورکمان لەلایەكو عەرەبی شیعە لەلایەکی دیکەوە، ئەوەبوو لەماوەی (١٠) ساڵدا ژمارەی عەرەب لە (٩٢٢٥٢) کەسەوە لەساڵی (١٩٥٧)ەوە بووە (٢٨٧٥٥) کەس‌و رێژەی تورکمان لەپارێزگای کەرکوك بۆ (١٦٪)ی دانیشتوانی پارێزگاکە دابەزی، ئەوە لەکاتێکدا ساڵی (١٩٥٧) ژمارەیان لە (٨٣٣٧١) کەس تێدەپەڕی، دوای بیست ساڵ لەجیاتی ئەوەی ژمارەیان دووقات زیادبکات بۆ (٨٠٣٤٧) کەس دابەزی، ساڵی (١٩٩٧)یش سەرژمێریی رەسمیی عیراق ژمارەی تورکمانی بە (٤٠٣٧٧) لەکەرکوك مەزەندە کردبووو دوای پێنج ساڵ ئەم ژمارەیە بووە (٤٤٤١٤) کەس کەدەکاتە (١٠,٨٧٪) رێژەی دانیشتووانی کەرکوك ئەمە بەگوێرەی قسەلۆکەکانی عیراقی، بەم جۆرە واقیع ئەوە دەسەلمێنێ کەمەترسی لەسەر نەتەوەی تورکمان‌و بوونی، لەشۆڤێنیەتی عەرەبی‌و دیکتاتۆریەتی سەدامییەوە دێت. لەبەر ئەوە هەقی خۆمانە نهێنیی هاوکاریکردنی بەرەی تورکمانی لەگەڵ پاشماوەی سەدام‌و ئەوانەی کە سەدام بەسەر کەرکوکی سەپاند بوون بۆ بەعەرەبکردنی، لای ئێمە جێگەی سەرسوڕمان بێ.

**کەواتە چارەسەر بۆ شاری کەرکوك چییە؟!**

تەگبیرو چارەسەر لەو دوو ئیدیعا پووچەدا نییە کە کەرکوك شارێکی تورکمانییە یان شارێکی کوردییە، ئەم دوو ئیدیعایە هەردووکیان لەڕاستیی و واقیعەوە دوورن.

١-کەرکوك هەرگیز رۆژێك لەرۆژان تەواو شارێکی تورکمانی نەبووە، هەر لەسەردەمی عوسمانییەوە تا سەردەمی عیراقی هەموو سەرژمێرییەکان ئەوە نیشان دەدەن کە تورکمان کەمینەی دانیشتووانەکەی بوون، لەسەردەمی عوسمانیدا فەرهەنگی ئەعلامی تورکی کەوەك دائیرەی مەعاریفی عوسمانییە ئەوەی تۆمارکردووە: (اهالیسنك اوچ ربعی کردو قصوری ترك و عربو وسائره) واتە سێ چارەکی دانیشتووانی کوردو ئەوانی دی تورکو عەرەبو هی دیکەن) ل-٣٨٤٦ی فەرهەنگی ئەعلام. لەیاداشتێکیشدا کە خوالێخۆشبوو عیسمەت پاشا ئینۆنۆ لەکۆنگرەی لۆزان پێشکەش بەکۆمەڵەی نەتەوەکان کردووە ئەم ژمارانە لەبارەی لیوای کەرکوك-ەوە هاتوون:

کورد (٩٧٠٠٠)، تورکمان (٧٩٠٠٠)، عەرەب (٨٠٠٠)، لەیەکەم سەرژمێریی عیراقیشدا حکومەتی عیراقی ئەو ژمارانەی داوە:

ساڵی ١٩٢٤ کورد (٤٧٥٠٠)و تورکمان (٢٦١٠٠)، لەسەرژمێری ١٩٥٧ی عیراقیشدا ژمارەکانی کەرکوك بەم جۆرەن: کورد (١٨٧٥٩٣)، تورکمان (٨٣٣٧١)،

لەسەرژمێریی ساڵی (١٩٧٧)یشدا ژمارەکانی شاری کەرکوك بەم جۆرەن: کورد (١٨٤٨٥٧)، تورکمان (٨٠٣٤٧)، لەسەرژمێریی ساڵی ١٩٩٧یشدا ژمارەکان لەسەر کەرکوك بەم جۆرەن: کورد (١٠١٦٠٧)، تورکمان (٤٠٣٧٧). بەڵام ئەگەر ژمارەی ئەوانەی بەبیانووی گۆڕینی نەتەوەیان کراون بەعەرەب زیادبکەین ئەوا ژمارەی تورکمان دەبێتە ٤٤٤١٤ + ٤٢٣٨٦ = ٨٦٦٠٠و ژمارەی کورد دەبێتە (١١١٧٦٧ + ٣٨١٤٧) = ١٤٩٩١٤ کەس.

٢-ئیدیعای شۆڤێنییەکانی کوردیش کەشاری کەرکوك تەواو شارێکی کوردییە ئەویش پووچە، چونکە پێچەوانەی راستیو واقیعە، چونکە کوردو تورکمانو مەسیحیو عەرەب خەڵکی راستەقینەن تێیدا، لەبەر ئەوە ناوی دەنێین شاری برایەتیو نەتەوەیی، پێویستە بەشارێکی هاوبەشی بزانینو هەمووان مافی بەڕێوەبردنیان هەبێو بەڕاستی چێژ لە مافی هاووڵاتیبوونی یەکسان وەربگرنو کارەکان لەنێوان هەمووواندا بەعەدالەت دابەش بکرێو هاووڵاتییەکانی بێ جیاوازی خێر لەسەروەتو سامانەکەی ببینن.

ئێمە پێمان وایە چارەسەرێکی وەك ئەو چارەسەرییەی شاری برۆکسلی فرە نەتەوە لەوانەیە باشتربێ بۆ چارەسەرکردنی کێشەی پێکەوەژیانی برایانە لەکەرکوك.

٣-لەڕووی جوگرافییەوە کەرکوك دەکەوێتە ناو هەرێمی کوردستانی جنوبی، تەنانەت بەپێی دانپێدانانەکانی تورکی عوسمانیو بەریتانیو بەگوێرەی لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکانو ئەو لیژنەیەش بێت کە لەوڵاتە ئەوروپاییە بێلایەنەکان پێکهاتبوو.

لەسەردەمی عوسمانییەوە تا (١٨٧٩) کەرکوك مەڵبەندی ویلایەتی شارەزوور بووە کە لەپاڵ کەرکوك هەولێرو سلێمانیو هێندێ ناوچەی کوردستانی ئێرانی ئێستاشی بەخۆوە دەگرت.

چەند نەخشەیەکی عوسمانیو ئەوروپاییمان لەبەردەستدایە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنو دەیسەلمێنن کەکەرکوك دەکەوێتە ناو هەرێمی کوردستانی عوسمانیو تا ئەوکاتەش ئەو لیژنەیە کەکۆمەڵەی نەتەوەکان پێکیهێنابوو کەرکوك نە سەر بەعیراقو نە سەر بەخاکی تورکی بووە، بڕیاری لیژنەکەی سەر بەکۆمەڵەی نەتەوەکانیش بەم جۆرە بووە:

"بۆ ئەم مەبەستە گەڕاینەوە لای مێژوونووسانو جوگرافیناسە دێرینەکانی عەرەبو ژمارەیەکی زۆر نەخشەی عەرەبیو سەدان نەخشەی ئەوروپایی کە لەنێوان سەدەی شازدەو بیستدا کێشراون، هەروەها کتێبەکانی ئەسفاری هەموو سەردەمەکانو سەرچاوە جوگرافییەکانو کتێبە جوگرافییەکانی خوێندن کە

لــــەخوێندنگاكانی ئامـــــادەیی عـــــەرەبی لەمیســــر
بـەكاردەهاتن و لیژنەكـە لەسـەر بوونــی سـێ ناوچــەی
روون و ئاشـكرا راوەســتا: عـیراقی عـەرەبی و جـەزیرەو
كوردسـتان، عـیراق لــەباكوورەوە لــەهیت-تكریـت یـان
چیای حەمرین تێناپەڕێ، نەشكرا ئەوە ساغ بكرێتـەوە
كەبەشێك لەو خاكەی ناكۆكی لەسـەرە رۆژێـك لـەڕۆژان
بەشێك نـەبووە لـەعیراقی عەجـەمی، ئەوەش دەسـەلمێنن
كـە لەهـەموو ئەدەبیاتـە جوگرافیـەكاندا هـەر لـە (فتـح)ی
عەرەبییـەوە تـا مێـژووی دەسـتپێكردنی لێكۆڵینـەوەی
لیژنەكـە لەسـاڵی (١٩٢٥) رۆژێ لـەڕۆژان ئـەو خاكـەی
ناكۆكی لەسـەرە بەشـێك نـەبووە لـەعیراق، لـەڕابردووش
نـاوی (عـیراق) لای دانیشـتووانی ویلایـەتی موسـڵ وەك
ناوێك بۆ وڵاتەكەیان لەسەر زار نـەبووە، بـەڵام بەهـەرحاڵ
لای عــــەرەب لـــــەناوی (میزۆپۆتامیــــا)ی ئـــــەورووپایی
نەناسراو زیاتر قبووڵ كراوە، كـە میزۆپۆتامیـا نیـوەی
رۆژئـاوای ئــەو خاكــەی بــەخۆوە گرتبــوو كــەناكۆكی
لەسەربوو، بەڵام ئەو قسانەی حكومەتی توركی كەدەڵێ
ویلایەتی موسـڵ بەشـێك بـووە لەئـەنادۆڵ ئـەو لیژنەیـە
پێـی وایـە كەڕاسـت نییـە چونكـە سـوریاو كوردسـتانی
خۆرئـاوا ئـەم دوو هەرێمــە لێــك جــودا دەكاتـــەوە"
*(سەرچاوەكە: كێشەی موسڵ/ چاپی*
*سێیەم-چاپی زانكۆی بەغدا/ ل ٧٨)* بـەم جـۆرە
لــەبڕیاری لیژنـــە بێلایەنەكـــەی لێكۆڵینـــەوەی ســـەر

بەکۆمەڵەی نەتەوەکاندا دەردەکەوێ کە کەرکوک بەشێك بووە لەکوردستان نەك لەعیراق و تورکیا.

**کەواتە چارەسەری کێشەی کەرکوك چییە؟**

پێمان وایە چارەسەرەکە لەوەدایە کە:

١-دان بەحەقیقەتە مێژووییەکاندا بنرێ.

٢-بەگوێرەی سەرژمێرییەکان دان بەواقیعی ئێستادا بنرێ.

٣-بەگوێرەی بڕیارەکانی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی بارودۆخی کەرکوك ئاسایی بکرێتەوە کە بەم جۆرەیە:

((سەبارەت بەڕاگواستن و پاکتاوکردنی رەگەزیی و گۆڕینی واقیعی نەتەوەیی))

"کۆنگرە ئیدانەی راگوێزانی بەزۆرو پاکتاوکردنی رەگەزیی و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی و ئەو گۆڕانانە دەکات کە بەسەر واقیعی نەتەوەیی ناوچەکانی کەرکوك و مەخمورو خانەقین و سنجارو شێخان و زمارو مەندەلی و شوێنەکانی دیکەدا هاتوون، هەروەها کۆنگرە داوا دەکات شوێنەوارەکانیان بەپێی ئەم رێنماییانە نەهێڵدرێن:

أ-گەڕانەوەی راگوێزراوەکان بۆ جێگەی خۆیان و گێڕانەوەی ماڵ و موڵکیان و قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی پێیان گەیەندراوە.

ب-گێڕانەوەی ئەوانەی دەسەڵات لەو شوێنانەی سەرەوە ئاماژەیان پێکراوە هێنابوونی، بۆ شوێنەکانی پێشوویان.

ج-گەڕانەوەی کوردە فەیلییەکانو هەموو ئەو عیراقییانەی بەبیانووی رەگەزی ئێرانی بۆ دەرەوەی وڵات راگوێزراون بۆ عیراق بەبێ گوێدانە رەگەزیان، ئەوانەش کەدەسەڵات بێ هیچ هەقێك هاووڵاتیبوونی عیراقی لێ داماڵینو قەرەبووی ئەو زەرەرو زیانانەیان بۆ بکرێتەوە کەلێیان کەوتووەو ئاشکراکردنی چارەنووسی ئەو فەیلییانەی لەنیسانی ١٩٨٠وە گیراون".

"لابردنی هەموو ئەو ئیجرائاتە ئیداریانەی رژێم لەساڵی ١٩٦٨ەوە پیادەی کردوون بەمەبەستی گۆڕینی واقیعی دیموگرافی لەکوردستانی عیراقدا".

٤-ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کەرکوك ئەوەش دەگەیەنێ کەپارێزگای کەرکوك بگێڕدرێتەوە سەردەمی پێش لەتکردنو دابەشکردنی بەسەر پارێزگای صلاح الدینو دیالەو سلێمانی، ئەویش بەگێڕانەوەی بۆ سنووری ئەسڵیی لیوای کەرکوكو دواتر گێڕانەوەی قەزاکانی توزخورماتوو کفریو کەلارو چەمچەماڵ بۆی.

٥-بەگفتوگۆیەکی راستگۆی برایانە قسە دەربارەی چارەنووسی کەرکوك بکرێ لەنێوان کوردو تورکمانو عەرەبە رەسەنەکانو مەسیحییەکان (کلدۆئاشوور) بۆ

بەدیهێنانی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان بۆ هەمووان و هەرلایەنەو هی خۆی.

لێگەڕێن خەڵکەکە بەگوێرەی سەرژمێریی ١٩٥٧ یان راپرسییەکی راستەقینە چارەنووسی کەرکوك دیاری بکەن بۆ ئەوەی بزاندرێ داخوا حەز دەکەن بێنە سەر هەرێمی کوردستانی عیراق.

ئەوەیە چارەسەری بنچینەیی، بەلاّم چارەسەری کاتیی لەم قۆناغی گواستنەوەیەدا وادەکرێ:

١-پتەوکردنی گیانی برایەتی و پێکەوەژیان لەنێوان کوردو تورکمان و عەرەب و کلدۆئاشووریدا.

٢-پێکهێنانی ئیدارەیەکی هاوبەش بۆ شاری کەرکوك و پارێزگاکەی و دابەشکردنی کاروبارە ئیدارییەکان و تەعلیمییەکان و شارەوانییەکان لەنێوان هەر چوار نەتەوەدا.

٣-خۆبەدوورخستن لەئیستیفزازو گرژی و دوژمنداریی تاك و کۆ.

٤-پێکەوە بەشداریکردن لەیانە کۆمەلاّیەتی و رووناکبیرییەکان و پێکهێنانی مەڵبەندێکی رووناکبیری و وەرزشیی هاوبەش.

٥-پێکهێنانی کۆمپانیای هاوبەش لەنێوان بازرگان و بەڵێندەرەکانی هەر چوار نەتەوە.

٦-هاندانی کوردەکان بۆ گەشەپێدانی فەرهەنگی دیموکراتی تورکمانی.

٧-پێشکەشــکردنی کۆمــەکی مــاددی لەلایــەن حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتانەوە بـۆ تیپـە وەرزشــی و رووناکبـیری و یانـە کۆمەڵایەتییـەکان و دەزگـاو نـاوەندە رووناکبیرییــەکانی لاوانــی تورکمــان و عــەرەب و کلدۆئاشووری و هی دیکە.

٨-دژایەتیکردنی بـیری شـۆڤێنی کـوردو تورکمـان و عـەرەب و رەواج پێدانـی بـیری پێکـەوەژیانی ئاشـتییانەو برایانەو بڵاوکردنـەوەی گیانی خۆشەویستی و برایـەتی لەنێوان هەمووواندا.

# بەرژەوەندییە راستەقینەکانی نەتەوەی تورکمان لەکوێدایە

## -٣-

## لەگەڵ برایەتیی کوردو تورکمان

چەند سەد ساڵێك کوردو تورکمان لەسایەی یەك رژێمی عوسمانیدا ژیانو زیاتر لەحەفتا ساڵیشە لەنێو عیراقدا دەژین، ناوچە کوردی-تورکمانی-یەکان تا ساڵی (١٨٧٩) لەچوارچێوەی ویلایەتی شارەزوور بوونو تورکمانو کورد پێکەوە بەتەبایيو برایەتی دەژیان، بێ شەڕو گێچەڵ، پەیوەندیی کوردی-تورکمانی تەنیا ساڵی (١٩٥٩) بۆ ماوەی دوو رۆژ ناکۆکییەکی خوێناویی تێدا روویداو لەلایەن چەند ئاژاوەچيو کەسانێکی ئیستیفزازییەوە وەحشیگەرانە هێرش کرایە سەر برا تورکمانەکانو چەند جینایەتێکی تیرۆر دەرهەق بەهێندێ لەبرا تورکمانەکان کراو وەحشیگەرانەش چەند دوکانو ماڵێك پەلاماردران کەخێرا هۆشمەندەکانی قەوم کەوتنە ناوبژیکردنو چاککردنی نێوانیان، دواتر هەردوو نەتەوەی کوردو تورکمان دووچاری سیاسەتی پاکتاوکردنی رەگەزیی

بەعسییانەو ڕەتکردنەوەی مافەکانیان و هەوڵەکانی تواندنەوە بوونەوە لەقاوغی (نەتەوەیی عەرەبی بەعسی) لەسەر بنەمای بیروباوەڕی عەفلەقی کە لەپرۆگرامەکەیدا هاتووەو داواکارە وەك بەرنامەی عەفلەقی ناویان دەبا کەمینەکان بتوێندرێنەوە، یانیش وەك ناوی ناوە لەخاکی عەرەبی رابگوێزرێن، لەگەڵ ئەوەی کوردو تورکمان نە لەخاکێکی عەرەبی نیشتەجێ بوون و نە نیشتەجێشن. بەم شێوەیە کارەسات و سیاسەتی شۆڤێنی، کوردو تورکمانی پێکەوە کۆکردەوەو خستنیە ناویەك سەنگەر تا بەرگریی لەبوونی خۆیان و مافەکانیان بکەن. مەترسیی تازەبوونەوەی ئەم سیاسەتە شۆڤێنییە بۆ خۆی رایەڵێکی بەهێزی دیکەیە لەنێوان هەردوو نەتەوەی کوردو تورکماندا.

پاشان کوردو تورکمان لەمەزهەبی ئایینیشدا هاوبەشن و هەردوو نەتەوەی تورکمان و کورد یەك چارەنووس و ئایندەیان هەیە پێکەوەش ئاواتەخوازی دیموکراسی و مافی نەتەوەیی و مافی مرۆڤن. هەردوو نەتەوەش ئاواتەخوازی سیستەمێکی دیموکراتی پەرلەمانی عیلمانین و دژی هەموو جۆرە دیکتاتۆریەتێکن جا سیاسی بێ یان مەزهەبی.

گومانی تێدانییە کەهەردوو نەتەوەی تورکمان و کورد کەپێکەوەو شانبەشانی یەك لەشارو ناوچەکاندا دەژین و ناتوانن لەیەکتر جودابېنەوە، بەڵکو

بەرژەوەندیی هاوبەشیان وادەخوازێ بەبرایەتی بژینو هاریکاری یەکترو کاری هاوبەش بکەن بۆ خێری هاوبەش.

لەڕاستیشدا بەرژەوەندیو قازانجە نەتەوەییو ئایندەییەکانی هەردوو نەتەوەی تورکمانو کورد یەکگرتووو هاوبەشەو هەرگیز لێك هاوێر ناکرێنو هەڵناوەشێنەوە، بۆیە لەسەر خێرخوازانو هۆشمەندەکانی هەردوو نەتەوە پێویستە لێبڕاوانە کار بۆ روونکردنەوەی ئەو راستییانە بکەن بۆ جەماوەری تورکمانو کورد تا برایەتی تورکمانو کورد پتەوبێو بکرێتە بەردی بناغە بۆ بنیاتنانی تەلارێکی ئەوتۆی پەیوەندییە سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیو نیشتمانییەکان کە لەبەردەم رەشەباو مەترسییەکاندا خۆی رابگرێ.

بەپێچەوانەی ئەوە تورکمانو کورد نە ئیسراحەت دەکەنو نە داخوازییەکانو ئاواتە رەواکانیان دێننەدی ئەگەر بێتو پەیوەندیی نێوانیان گرژبێتو شەڕو ناکۆکی تێ بکەوێ.

کەواتە هیچ بوارو رێگەیەکیان لەبەردەمدا نییە جگە لەپێکەوەژیانی برایانە، جا چ لەنێو هەرێمی کوردستانی عیراقدا بێو چ لەچوارچێوەی عیراقێکی دیموکراتی فیدرالی یەکگرتووو سەربەخۆ. لێرەدا لەسەر یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانو پارتی دیموکراتی کوردستان پێویستە لێبڕاوانە کار بۆ دەستەبەرکردنی

مافـەكانی توركمـان بكــەن لەهــەموو بــوارە ئیــداریو فەرهـەنگیو كۆمەلایەتییـەكانو هـی دیكـەش، بۆ ئـەوەی كـــورد بـــەكردەوە بیسەلـــمێنن كەپشـــتی بـــرا توركمانـەكانیان دەگرن، هـەروەها دەبـێ ئـەم دوو حزبـە بـەگژ شـۆڤێنیەتو دەمارگـیریی كوێرانـەی نەتـەوەی كوردە ساویلكەكاندا بچنەوەو دواتریش گیانی برایـەتی كوردو توركمان پتەوبكەن.

## بەرژەوەندییە راستەقینەکانی نەتەوەی تورکمان لەکوێدایە

-٤-

## بەرەی تورکمانی بەرەو کوێ دەچێ..؟

کاتێ دەستەیەك خێرەومەند لەبرا تورکمانەکانمان کەوتنە دامەزراندنی بەرەی تورکمانی وێڕای تێبینیمان لەسەر زێدەگوتنەکانی ئیدیعاکانیان دەربارەی تورکمانیبوونی هەولێرو کەرکوكو موسڵو تەنانەت سلێمانیش، کەهێندێك دەیلێنو دەیلێنەوە، بەلاَم یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بەگردبوونەوەی برا تورکمانەکانو یەکخستنی قسەیان بۆ پێکەوە خەباتکردنیان لەپێناو عیراقێکی دیموکراتی فیدرالی یەکگرتوو کەئاوات و خواستەکانی کوردو تورکمانو کلدۆئاشووری لەپاڵ برا عەرەبەکانیان تێدا بێتەدی.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دوودڵی نەکرد لەپێشکەشکردنی هاریکاریی سیاسیو ئیعلامی بەپێی توانا و بەهەر شێوەیەك بووبێ بۆ بەرەی تورکمانی، ئەو هاریکارییەش ئاسایی بوو، تەنانەت سەرۆکەکەیان، کەسایەتیی نیشتمانپەروەری تورکمانیی ناسراو دکتۆر

مڤــهر ئەرســـەلان بەشـــداری لـــەوەفدێکی بـــەرەی کوردستانی‌دا کرد بۆ سـەردانی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکاو لەوێ بواری بۆ رەخسا بیروڕاو هەڵوێستی برا تورکمانــەکان‌و داخوازییــەکانیان لــەو کۆبوونەوانــەدا دەربـبڕێ کـە لەگـەڵ پیـاوانی کۆنگرێـس‌و بەرپرسـانی دەرەوەو هی دیکەدا کران.

لەیەکــەمین حکومــەتی هــەرێمدا هــەردوو حزبــە سـەرەکییەکە داوایـان لەبـەرەی تورکمـانی کـرد بەپلـەی جێگری سەرۆکی حکومەت‌و دوو وەزیـر بەشدارییی تێدا بکەن، وێڕای ئەوەش کەژمارەی تورکمان لـە (ناوچـەی ئۆتۆنۆمـی کوردسـتان) وەك لـەزمانی رەسمـی عـیراقدا ناودەبرێ، زۆر نـەبوو و لەگەڵ داخوازییەکـە نـەدەگونجا، کـەچی لەگـەڵ ئەوەشـــدا پێمـــان باشـــتربوو تـــەقدیری واقیعی هەرێمی کوردستان بەدیدی ئاینده بکـەین، بـەڵام بـرا تورکمانـەکان بەفـەرمانێك لـەدەرەوە بەشـداریکردنیان لەحکومەتی هەرێم لێ قەدەغەکرا.

ســـەرەڕای ئـــەوەش ئـــەم حکومەتـــەی هـــەرێمی کوردســتان چــەند قوتابخانەیــەکی بــەزمانی تورکمـانی کــردەوەو بەڕێوەبەرایەتییــەکی تایبــەت بــەتورکمانی دامەزراندو ئازادییە دیموکراتییەکانی بۆ فەراهەمکردن، ئـازادیی رۆژنامەگـەری‌و رادیـۆو تەلـەفزیۆن‌و تەنانـەت پێکهێنانی میلیشیای چەکداریش.

یــەکێتیی نیشـتمانیی کوردســتان بــۆ دڵنیاکردنیــان پرۆتۆکۆلێکــی هاریکــاری لەگــەڵ بــەرەی تورکمـــانی

مۆرکرد، لەگەڵ ئەوەی کە بەشێوەیەکی هەڵە نووسرابووو لەجیاتی کوردستان نووسیبوویان (الملاذ الآمن) کە بەتەنیا زاخۆو دهۆكو ئامێدی دەگرێتەوە، بەم جۆرە پرۆتۆکۆلە پێشنیازکراوەکە هیچ ئیلتیزاماتێکی بۆ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان تێدانەبوو! بەڵام یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەر بەردەوام بوو لەسەر هاریکاریکردنی بەرەی تورکمانیو بەتەنگەوەچوونی داخوازییەکانیان سەبارەت بەدابینکردنی زەویو دانانی ئێستگەی رادیۆو تەلەفزیۆن لەکفریو شوێنی دیو تەرخانکردنی بەرنامەیەکی تورکمانی بۆیان لەتەلەفزیۆنی ناوەندیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا.

تا ئازادکردنی کەرکوکیش پەیوەندییەکان باش بوون، ئەگەرچی بەرەی تورکمانی نەیانتوانی بگەنە کەرکوك تەنیا لەرێگەی سلێمانیو چەمچەماڵو بەیارمەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان-ەوە نەبێ، بەڵام لەجیاتی چاکەدانەوەیان یان بەلانی کەم گرتنەبەری هەڵوێستێکی بەویژدانانە، سەرکردایەتی بەرەی تورکمانی خێرا دەستی بەشاڵاوبردنە سەر ی.ن.كو پێشمەرگە کردو بوختانێکی زلی هەڵبەست گوایا پەنجا تورکمان بەدەستی پێشمەرگە کوژراون، کەدواتر دەرکەوت شوکر بۆ خوا یەك کەسیش نەکوژراوە. سەرکردایەتی بەرەی تورکمانی لەسەر گومرایی خۆی بەردەوام بووو درۆیەکی دیکەشیان

هەڵبەست گوایا ئەمریکییەکان پەنجا ملیۆن دۆلاریان داوەتە جەلال تاڵەبانی تا بۆ بەکوردکردنی کەرکوك خەرجی بکات!! ئەم درۆو دەلەسانەش لەڕاگەیاندنی تورکیدا بەشێوەیەکی فراوان رەواجیان پێدرا.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان چاوپۆشی لەخراپەکارییەکان و پێشێلکردنی پرۆتۆکۆلەکە کرد لەلایەن بەرەی تورکمانییەوە، کە لەپرۆتۆکۆلەکەدا هاتووە ناکۆکییەکانی نێوان هەردوولا بەر لەوەی بگاتە راگەیاندن چارەسەربکرێن.

ئێستاش حەزدەکەین لەسەر بنچینەی بیروباوەڕو قازانجە هاوبەشەکان و چارەسەرکردنی دۆستانەی ناکۆکییەکان و پەرۆشی بۆ پاراستنی کەرکوك لەپاکتاوکردنی رەگەزیی و سڕینەوەی شوێنەوارەکەی پەیوەندییەکان ئاسایی بکەینەوە.

سەرکردایەتی بەرەی تورکمانی لە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و هێزە دیموکراتییە کوردستانییەکانی چاکتر دەستناکەوێ بەرگری لەمافە نەتەوەییەکانی تورکمان بکات و سووربێ لەسەر برایەتیی کوردو تورکمان. لەگرتنەبەری سیاسەتی هاریکاریکردنی پاشماوەکانی رژێمی سەدام و هاوردەکان و هەموو ئەوانەی دژایەتی گەلی کوردو مافی کورد دەکەن لەدۆڕان زیاتر هیچی دەست ناکەوێت پێچەوانەکەشی راستەو هاریکاریکردنی لەگەڵ هێزە دیموکراتییە کوردستانییەکان و لەوانەش یەکێتیی

نیشتمانیی کوردستان خزمەتی نەتەوەی تورکمان و مافە رەواکانیان دەکات جا ئەمە لەهەرێمی کوردستان بێ یان لەعیراقی نوێی دیموکراتیدا.

بەرژەوەندیی راستەقینەی نەتەوەی تورکمان لەبرایەتی کوردو تورکمان و هاوپەیمانێتی نێوان هەردوو نەتەوەو ئەو هێزانەدایە کە لەپێناوی دیموکراسیی و فیدرالی و فرەحزبیی و مافی نەتەوە براکانی کوردستان و عیراقدا خەبات دەکەن.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان سەرلەنوێ دەستی برایەتی و پێکهاتنەوە، دەستی گفتوگۆی برایانەی جیددی بۆ بەرەی تورکمانی درێژدەکات، شانازیش بەو پەیوەندییە هاریکارییانەی دەکات کە لەگەڵ سەرجەم هێزە تورکمانییەکاندا هەیەتی و داوای لێدەکات دەرهەق بەگەلی کوردو هێزە دیموکراتییەکان چاو بەهەڵوێستەکانیاندا بخشێنێتەوەو لەو راستییەش بگەن کەناتوانن باز بەسەر ئەو واقیعەدا بدەن کە لەناوچەکانی پێکەوەژیانی هەردوو نەتەوەی کوردو تورکماندا هەیە، هەروەها دەرك بەو راستییەش بکەن کەدژایەتیکردنی کوردو هێزە دیموکراتییەکانی، جگە لەکارەسات و ماڵوێرانیی بۆ برا تورکمانەکان هیچی دی ناکەوێتەوە کە نەبیانووی هەیەو نەقازانجێکیشی بەدواوەیە. ئەمە جگە لەوەی کە لەگەڵ حەقیقەتی پێکەوەژیانی برایانەی نێوانیان یەك ناگرێتەوەو پێچەوانەی قازانجە هاوبەشەکانیشە، بەتایبەتی کەئێمە

هەمیشـە داوای رێزگرتـن لـەمافی نەتـەوەی تورکمـان دەکـەین جا لـەچوارچێوەی هـەرێمی کوردسـتانی عـیراق بـێ یـان لــەناو هــەموو عــیراقدا. لــەکۆتاییدا لەســەر سـەرکردایەتی نوێـی بـەرەی تورکمـانی پێویسـتە دەرك بــەو راســتییە بکــەن کەپشتگوێخســتنی کــوردو کوردستان‌و بڕیارەکانی کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی بووەمایـەی دابڕانـی بـەرەی تورکمـانی لەئۆپۆزسـیۆنی عیراقی‌و لەدەستدانی پایەیەکی سەرکردایەتی لـەوێداو دواتریش لە ئەنجومەنی حوکمی ئینتیقالیدا.

١-بيلۆگرافیای رۆژنامەنوسیی کوردی لەسلێمانی
٢-شەڕی بەردەکی سەرای سلێمانی
٣-سلێمانی و سەلاحوددینی موهتەدی
٤-ژیان، بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی ١٩٢٦-١٩٣٨
٥-ئەمریکاو عیراق و ئەگەرەکان، کورد لەبەردەم چاوەڕوانییەکاندا
٦-یادی ٩ی حوزیرانی ١٩٦٣
٧-کارەساتی مەنعی تەجەولەکەی ١٩٨٥
٨-حکوومەتی کوردستان لەسلێمانی
٩-بەڵگەنامە- بەرگی یەکەم
١٠-تۆمارێکی شارەوانیی سلێمانی
١١- سلێمانی، زەمینەی پەرەسەندن و ململانێی تەسەوف
١٢-ئەلبومی مەکتەبی فەیسەڵییە
١٣-سەرچاوەکانی ئاو
١٤-فەرهەنگی ئینگلیزی-کوردی
١٥-رۆژنامەی ژیان
١٦-بەڵگەنامە - بەرگی دووەم
١٧-سەرۆك شارەوانییەکانی سلێمانی (١٨٩٠-٢٠٠٣)
١٨-یادی دووسەد ساڵەی شاری‌سلێمانی
١٩-لەدوو توێی یادداشتی شاردا
٢٠-شەکرە شارەکەم سولەیمانی
٢١-لەمەرگستانی حامیەوە بۆ سەیرانگەی پارکی ئازادی
٢٢-وەرزش و شاری سلێمانی
٢٣-توێژینەوەکانی شاری سلێمانی
٢٤-پرسیارەکانی هاتوچۆ بۆ شۆفێری ئوتومبیل
٢٥-گوڵ و گوڵلەو مارینز
A Sammary about Sulaimani city-٢٦
٢٧-دەربارەی فیدراڵی یەکگرتن یەکێتیی نیشتمانیی عیراقی